پۆڵ ستراترن

# دیكارت

گۆڕینی لە فارسییەوە

ڕەووف بێگەرد

سلێمانی ٢٠٠١




- ناوی كتێب: دیكارت
- بابەت: فەلسەفە
- نووسینی: پۆل ستراترن
- وەرگێڕانی: ڕەووف بێگەرد
- مۆنتاجی كۆمپیوتەری: تاڤگە فائق
- ژمارەی سپاردن: ٣٠٢ی ٢٠٠١
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: (٥) دینار
- ئۆفسێتی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم









# پێرست









# سەرەتا

لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمی زاینیدا بزاوتی فەلسەفە دابوویە دواوە. ئەوە دیکارت بوو کە جارێکی دی فەلسەفەی وەگەڕخستەوە.

فەلسەفە بۆ یەکەمجار لەسەدەی شەشەمینی پێش زاینیدا سەری هەڵدا. دوای دوو سەدە، بە دەرکەوتنی پیاوانێکی وەك سوکرات، دوای ئەو ئەفلاتون و ئەرەستۆ، فەلسەفە کەوتە چەرخی زێڕینی خۆیەوە. پاشان، تا دوو هەزار ساڵ لەو بوارەدا چ شتێکی گرنگ ڕووی نەدا، بەوتەیەکی دی، لەو ماوە درێژەدا کارێکی ڕەسەن ئەنجام نەدرا.

هەڵبەتە لەو ماوەیەدا فەیلەسوفانێکی دیار هاتنە گۆڕێ، لەسەدەی سێیەمی زاینییدا "فلوتین"ی خەڵکی ئەسکەندەریە، گۆڕانێکی بەسەر فەلسەفەی ئەفلاتوندا هێنا کە فەلسەفەی "ئەفلاتونی نوێ"ی لێ کەوتەوە،



پاشان نۆرە هاتە سەر "سانت ئاگوستین"ی خەڵکی هیپو کە فەلسەفەی ئەفلاتونی نوێی کێشایە نێو پێودانگێکەوە کە لەگەڵ خوداناسی (تیولوژیا)ی مەسیحیدا بگونجێت. ئیبن روشدی بیرمەندی موسڵمانیش چەند چاك سازیەکی لە فەلسەفەی ئەرەستۆدا کردو تۆماس ئەکیوناسیش لای خۆیەوە ئەم فەلسەفەیەی لەگەڵ تیولوژیای مەسیحیدا گونجاند، ئەم چوار کەسایەتیە سەربەخۆیە، هەریەکەیان بە جۆرێك جێ دەستی خۆیان بەسەر بەرەو پێش چوونی ڕەوتی فەلسەفەوە دانا، بەڵام هیچ کامیان فەلسەفەیەکی تازەیان دانەهێنا، زوربەی کاریان پەراوێز نووسی و شەرح و ڕوون کردنەوەی فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرەستۆ بوو. بەم جۆرە فەلسەفەی ئەم دوو فەیلەسوفەی سەردەمی فرە خودایی و بت پەرستی بوو بە بەردی بناغە بۆ فەلسەفەی مەزەبی کلێسای مەسیحی. هەر ئەم گۆڕینەی ماهیەتی فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستۆیە،. بوە بناغەی سەرەکی بۆ دروست بوونی فەلسەفەی قوتابخانەیی (سکولاستیك)، ئەم ناوە بەسەر چالاکیە فەلسەفیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بڕا، فەلسەفەی سکولاستیك هەمان فەلسەفەی کلێسا بوو کە بە دانەهێنان و نوێخوازی خۆی دەنازی، لەو سەردەمانەدا، دەرکەوتنی





هەر جۆرە بیرو باوەڕێکی نوێی فەلسەفی سەری بەرەو بەکافرکردن، دادگایی کردنی بیرو باوەڕو، ئەنجامیش بە فەرمانی کڵێسا بە ئاگر سوتاندن دەکێشا. وردە وردە بیرو باوەڕی ئەفلاتون و ئەرەستۆ لە ژێر لێکدانەوەی جۆراو جۆری ئەوانەدا کە شەرحی مەسیحیەتیان دەکردو، پشتگیری کردنی کڵێسا دا لە گۆڕنراو، هەر ئەمیش بو بە هۆی ئەوەی کەڕەگی هزری فەلسەفی وشك بکات.

لە ناوەراستی سەدەی پانزەهەمدا، ئەم بارە نالەبارە تا ڕادەیەك لە تەواوی بواری چالاکیە فیکریەکاندا سەردەستە بوو، لە سەرتا سەری ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستا فەرمانی ڕەهای بێ چەند و چۆن لە دەستی کڵێسادا بوو، بەڵام هەر لەو سەردەمانەدا، یەکەمین درز گەلێك کەوتە ساختومانی گەورەی بن بڕیەتی (قطعبت)ی فەلسەفەوە.

سەیر ئەوەیە کە بنەمای سەرەکی پەیدابوونی ئەو درزانە هەمان دنیای کلاسیك (یۆنان و ڕۆم) بوو کە ئەفلاتون و ئەرەستو هەر لەوێدا پێیان نابوە دنیای ژیانەوە، گەلێك لەو زانیاریانەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستا لەدەست چوبوون



یان لە یادکرابوون، جارێکی تر زیندو کرانەوەو بوونە سرووش بەخشی ڕێنیسانسی دانایی مرۆڤ.

ڕێنیسانس روانینی مرۆڤ تەوەرەیی لەگەل خۆیدا هێنا، بەرئەنجامی ئەم ڕوانینە بزوتنەوەی ئاین چاکی[1] بوو کە کۆتایی بە دەسەڵاتی کڵێسا هێنا.

بەم جۆرە، دوای تێپەڕینی نزیکەی سەد ساڵ بەسەر ئەم گۆڕانانە لە ئەوروپادا، هێشتا فەلسەفە لە کۆتی قوتابخانە گیریدا دامابوو، ئەم بارە تەنیا بە دەرکەوتنی دیکارت کۆتایی پێ هات کە فەلسەفەیەکی گونجاوی بۆ سەردەمێکی تازە داهێنا. زۆری نەبرد کە ئەم سیستەمە فەلسەفیە لەسەرانسەری ئەوروپادا بڵاوبووەوەو تەنانەت بۆ ڕێزی ئەو بە (دیکارتایەتی)[2] ناونرا.

## پەراوێز

*(١) Reformation. (مەسیحیەت) ڕاپەڕینی چاك کردنی ئاینی.*

*(٢) artesianism لە Cartesius ەوە وەرگیراوە کە ناوی لاتینی دیکارتە.*





# ژیان و بەرهەمی دیکارت

دیکارت بە درێژایی تەمەنی پیشەیەکی چەسپاو (ثابت)ی بۆخۆی دەستنیشان نەکردوە، ئەو لە بۆنە جیاوازەکاندا وەك سەرباز، ماتماتیك زان بیرمەند و خانەدان خۆی دەناساند، هەڵبەتە دوا ناونیشان زیاد لە هەموو ئەوانی دی لەگەل شێوەی ژیان و پێگە کۆمەڵایەتیەکەی ئەودا دەگونجا، هەر لە سەردەمی لاویەتیەوە هێند حەزی بە ژیانی خۆش و ئاسوودە بوو کە پاشان ئەمەی لێ بوو بە خوو، ئەو لە زێدی تایبەتی خۆیدا ژیانی بەسەردەبردو، نیوەڕۆ لەخەو هەڵدەستاو هەرکاتێك ئارەزووی بکردایە دەچوە سەفەر، تەواوی ژیانی دیکارت لەمەدا پوخت دەکرێتەوە نەبەسەرهاتی گەورە، نەهاوسەری، نەسەرکەوتن یاشکستی گەورەی کۆمەڵایەتی– بەم جۆرە. بێگومان دیکارت داهینەرترین



فەیلەسوفە کە تا پانزە سەدە دوای مەرگی ئەرەستۆ پێی نابێتە مەیدانی ژیانەوە.

رینە دیکارت[1] لە ٣١ مارتی ساڵی ١٥٩٦ زاینی لە شارۆچکەی لاهای[2] کە سی‌میل لە باشوری شاری‌تورەوە یە لە دایك بوو، ئێستا ئەو شوێنە بە ناوی دیکارتەوە ناو دەبرێت، ئەگەر بچیتە ئەوێ دەتوانیت ئەو خانوەی دیکارتی تیا لە دایك بوە ببینیت. هەروەها کلێسای سانت جورجیش کە لە سەدەی دوانزە دا دروست کراوە، کە دیکارت لە دایك بوو لەوێ شۆردنی تەعمید کردنەکەی کرا هەر لەو شارەدا ماوە.

رینە چوارەمین منداڵی خێزانەکەیە، دایکی دوای ساڵێکی تەمەنی ئەو لە کاتی لەدایك بوونی منداڵی پێنجەمدا کۆچی دوایی کرد، باوکی دیکارت ژواکیم– لە دیوانی باڵای بریتانی قازی بوو. شوێنی دادگا لە شاری رن لە ١٤٠ کیلۆمەتری شوێنی لە دایك بوونی دیکارتدا بوو، بۆیە ژواکیم لە نیو ساڵ کەمتری لە ماڵەکەی خۆیدا بەسەردەبرد. ژواکیم دوای مەرگی هاوسەرەکەی بە ماوەیەك دوبارە ژنی هێنایەوەو رینە لە ماڵی نەنکیدا پەروەردە بوو، لەو ماوەیەدا، دیکارت لە هەموو کەس زیاتر پەیوەندی لەگەڵ دایەنەکەیدا هەبوو.



PDF 4 KURD

ئەو خۆشەویستیەی دایەنەکەی زۆر بە چاکی پاراست و تا مرد دیکارت دەیژیاند.

دیکارت منالّیەتی خۆی لە تەریکیدا بەسەربرد، میزاجە لاوازەکەیشی ئەوەندەی دی لەو تەریکیەی زیاد کرد، بۆیە زوو فێری ئەوە بوو کە چۆن لە تەنیاییدا بژی، لەوە دەچێت کە دیکارت لە سالانی بەرایی ژیانیدا دەرونگەراو کەم دوو بوو بێت. مندالێکی ڕەنگ پەڕیوی قژ ڕەش و لوولی چاو گەورە و بەقولاچووبووبێت، کە بە چاکەتێکی ڕەش و پانتۆلێك و کلاوێکی لێوداری پان لەسەردا و ملپێچێکی درێژی ئاوریشمین لە ملدا لەناو باخەکاندا پیاسە بکات.

دیکارت لەتەمەنی هەشت سالّیدا خرایە قوتابخانەی شەو و ڕۆژانەی یەسوعییکانەوە کە تازە لە لافلش کرابوەوە، ئامانج لە دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە فێرکردنی مندالانی خێزانە خانەدانە ناوچەییەکان بوو، پێش ئەوە ئەو مندالانە خەریکی ڕاوو پەروەردەکردنی باز و سەرقالّی ئەو شتانە بوون کە لە مالّدا کاتی خۆیانیان پی بە فیڕۆ دەداو لە فێربوون و پەروەردەیان لا چاکتر بوو. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ئاشنای خێزانی دیکارت بوو، بۆیە لە قوتابخانە رینەی جوان و غەمبار ژوورێکی تایبەتی درا بوویە، هەروەها ڕێگای درابوو بە



ئارەزووی خۆی لەخەو هەستێت. وەك هەموو ئەو کەسانەی کە ئیمتیازێکی وایان دەدرێتێ، دیکارت دەوروبەری نیوەڕۆ لەخەو هەلّدەستا ئەو عادەتەی کە تا کۆتایی ژیانی وازی لێ نەهێنا– لە کاتێکدا کە قوتابیەکانی تر بەدەست یەسوعیە بەدو فیزیاویەکانەوە کە تەواو شارەزای پێچو پەناکانی فەلسەفەی قوتابخانەیی بوون بە توندی هەرەشەیان لێ دەکرا، دیکارتی هوشیارو جوان توانی لە فەزایەکی ئاسوودەدا دەست بە خوێندن بکات. نیوەڕۆ لەخەو ڕابێت و دوای نیوەڕوانیش بە ئەسپ سواری و شمشێر بازی و فلووت ژەندن بگوزەرێنێت. کە گەیشتە سەر بەجێهێشتنی ئەو قوتابخانەیە دیکارت لە هەموو قوتابیەکان زیاتر فێری زانیاری ببوو، تەنانەت باری میزاجیشی بە تەواوی چاك ببوو (ئەگەر چی کەمێك دوچاری ئەوە ببوو کە هەرخۆی بە نەخۆش بزانێت و بەدرێژایی تەمەنی پڕ لە تەندروستی خۆی لە سالانی ئایندەدا هێشتا ئەو هەستەی هەر تیا مابوو)

ئەگەر چی دیکارت لەسەردەمی قوتابخانەدا قوتابیەکی هەرەچاك بوو، بەلام وا دەردەکەوێت کە هەمیشە لە خوێندنەکەی نا قایل بووبێت، ئەوشتانەی لە قوتابخانە فێریان دەبوو زوربەی بەبێ نرخ دەهاتنە





بەرچاوی، ڕێنماییەکانی ئەرەستۆ کە سەدان ساڵ بوو لێکدانەوەی جۆربەجۆری لێکدەرەوەکانی لەسەر کەڵەکە دەبوو، خوداناسی ئاکویناس کە بۆنی کۆنی لێ دەهات و بۆ هەر پرسیارێك وەڵامی هەبوو و کەچی وەڵامی هیچ پرسیارێکیشی نەدەدایەوە بە وتەیەکی دی، زەلکاوێك لە میتافیزیك. لە دیدی دیکارتەوە، هیچ شتێك لەوانەی کە فێری ببوو، بێجگە لە ماتماتیك، جێگای یەقین نەبوون، دیکارت بە درێژایی ژیانی کە خاڵی بوو لە پەیوەندیە هەرە ناچاریەکانی وەك ماڵ، خێزان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان. تێکۆشا بن بڕی و یەقین لە تەنیا زەمینەیەکدا کە خووی پێوە گرتبوو، واتا لە دنیای زەیندا بدۆزێتەوە، بەناڕەزاییەوە وازی لە قوتابخانە هێنا، وەك سوکرات گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە هیچ نازانێت، تەنانەت ماتماتیکیش تەنیا هەر ئەوە دەتوانێت بکات کە یەقینێکی جیاواز لە وجودی مرۆڤ بەدەست بێنێت، تاقە شتێك کە ئەو یەقینی پێ هەبێت بێجگە لە مەسەلەکانی ماتماتیك بونی خودا بوو.

کە دیکارت لە تەمەنی شانزە ساڵیدا قوتابخانەی لافلشی بەجێ هێشت باوکی بۆ خوێندنی حقوق ناردیە دانشگای پواتیە.



چواکیم دیکارت حەزی بەوە بوو کوڕەکەی لە پیشەی دادوەریدا پلەو پایەیەکی باش بە دەست بهێنێت. وەك برا گەورەکەی رینە کە هەمان ڕێگای گرتبوو. لەو سەردەمەدا، کاری دادوەری زوربەی لە ڕێگای پەیوەندیە خێزانیەکانەوە بەدەست دەهات، ئەم سیستمی دانانی دادوەرە، بەو ڕادەیەی کە ئێمە ئەمڕۆ دەی بینین، دادوەری ناشایستەی بەرهەم دەهێنا. بەڵام دیکارت دوای خوێندنی دوو ساڵ لە بەشی حقوقدا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە تا ڕادەیەکی چاك ئەو زانستە فێر بوە.

لەو کاتەدا، موڵکایەتی چەند گوندێکی بچوکی وەك میراتی لە دایکیەوە بۆ بەجێ مابوو. دیکارت لەو موڵکانە دەرامەتێکی وای بەدەست دەهێنا کە بۆ ئەو جۆرە ژیانەی ئەو حەزی لێ دەکرد بەس بوو. بۆیە بڕیاریدا بۆ (بەدوادا گەڕانی بیرو باوەڕەکانی) بڕواتە پاریس. لەبەرئەوەی خێزانەکەی دیکارت وەك خانەدانێك حسابی بۆ دەکرا ئەوەیان لێ چاوەڕێ نەدەکردن کە کاتی خۆیان بە بیرکردنەوەوە بەرنە سەر. بەڵام ئیتر ژواکیم هیچی بۆ نەدەکرا، ئیدی کوڕەکەی مرۆڤێکی ئازاد بوو.

دوای دوو ساڵ، دیکارت لە ژیانی ڕەبەندی و خۆش گوزەرانی خۆی لە پاریس بێزار بوو. ئەگەرچی





خۆی بە خوێندنەوەی فراوان و جۆراو جۆرەوە خەریك کرد، هەروەها چەندین کتێبی تا ڕادەیەك جۆراو جۆری نووسی بەڵام وردە وردە دەبوە وابەستەی ژیانی کۆمەڵایەتی پایتەخت کە لای دیکارت ئەمە زۆر ناخۆش و بێزراو بوو، بێگومان ئەمە بەو مانایە نیە کە بیرو ڕای دیکارت تەنیا لەسەر ژیانی کۆمەڵگای پڕ باق و بریقی پاریس وا بێت، بەڵکوو دیکارت هەموو جۆرە ژیانێکی کۆمەڵایەتی بە بێزارکەر زانیوە، بۆیە ئەم بێزاریە تەنیا تایبەت نەبوو بە پاریسەوە.

دیکارت ژیانێکی ئارامی دوور لە هەراو زەنای لە فوربورگ سان جرمان لە پێش گرت، ئەو شوێنەی کەس هەقی بەسەر ئەوی ترەوە نەبوو، دیکارت لەوێ لە گۆشە گیریەکی تەواو دا ژیانی بەسەردەبردو دەیتوانی هەر بەو جۆرە بکەوێتە دوای بیرو باوەڕەکانی خۆی و لە ئاسودەییدا بژی و بەردەوام بێت. لەوە دەچێت کە دیکارت حەزی کردبێت تا کۆتایی تەمەنی بەو شێوەیە بژی، بەڵام دوای چەند مانگێکی ئەوێ لە ناکاودا کەوتەوە کەڵکەڵەی سەفەر.

لە ڕاستیدا، ژیانی دیکارت لەژێر کاریگەری دوو ئارەزودا بوو: گۆشەگیری و سەفەر، دەت وت لە هەموو تەمەنیا ئەم دوو ئارەزووە هاوسەنگیەکی چاکیان لەگەڵ



یەکتردا هەبوە. ئەو هەرگیز لەگەڵ هاوڕێکانیدا هەستی بە نزیکی نەدەکرد، مەیلی ئەوەیش نەدەکرد لەگەڵیاندا بێت، هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەداماڵێکی جێگیرو تایبەتی بۆ خۆی دروست بکات، ئەو تا کۆتایی تەمەنی بێ قەرارو تەنیا بوو.

لەگەڵ بەهەند گرتنی ئەم هەل و مەرجانەدا، دوا بڕیاری دیکارت سەیر دێتە بەرچاو. چونکە دیکارت بڕیاریدا پەیوەندی بە سوپاوە بکات. ساڵی ١٦١٨ ڕۆیشت بۆ هوڵەنداو بە ناونیشانی ئەفسەری خۆبەخشی لە سوپای شازادە ئۆرانژدا خۆی ناونووس کرد. سوپای پروتستانی شازادەی ئورانژ بۆ پارێزگاری کردن لەسەربەخۆیی یەکێتی هوڵەند بەرانبەر بە ئیسپانیای کاسولیك خۆی ئامادە دەکرد، ئیسپانیا دەیویست وڵاتی هوڵەند، کە پێشان لە ژێر دەستیدا بوو بخاتەوە ژێر ڕکێفی خۆی. لە ڕاستیدا ئەم پیاوە خانەدانە خوێن ساردو کاسۆلیکە کە هیچ جۆرە ئەزمونێکی سوپایی نەبوەو، وەك خۆی دەڵێت تەنیا هەندێك شمشێربازی و ئەسپ سواری لە قوتابخانەدا فێر بوە، چ کەڵکێکی بە سوپای هوڵەندە دەگەیاند؟ حوکم دان لەسەر ئەمە کارێکی دژوارە، ئەوسا دیکارت ئەسڵەن زمانی هوڵەندی نەدەزانی و لەسەر ڕەوشە تایبەتیەکەیشی کە خەوتنی





بوو تا نیوەڕۆ هەر بەردەوام بوو، ڕەنگە هۆڵەندیەکان هەر گوێ یان بەوە نەدابێت کە دیکارت ئامادە دەبێت یان نا، ئەویش زۆر بە هێوری لەخەیوەتەکەیدا دادەنیشت و لە بارەی موسیقا و شتی لەو بابەتەوە نامیلکەی دەنووسی (ئەگەر ئەمڕۆ بوایە دیکارتیان بە جاسووسی تۆمەتبار دەکرد، بەڵام وا پێ دەچێت کە لەو سەردەمەدا، سوپاکان دەرکی تەواویان لەسەر گرنگی جاسووسەکان نەبووبێت و ئامادە بوون پێشوازی لەهەر سەربازێك بکەن بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی لە چ میللەتێکە، ئەندازەی وەفاداریەکەی چەندە، تەنانەت چەند لە بۆنە سەربازیەکاندا بەشداری دەکات).

وادەرئەکەوێت کە دیکارت لە ژیانی ناو سوپادا تووشی بێزاری بووبێت، بەلای ئەوەوە ژیان لەوێدا "پڕە لە بێ کاری و کات بەفیڕۆ دان"، واتا لە سوپادا ئەفسەری تر هەبوون درەنگتر لە دیکارت لە خەو هەڵدەستان، ئەگەر وا بێت و سوپای ئیسپانی هێرشێکی کوت و پڕی لە دژی هوڵەندیەکان ئنجام بدایە، بێگومان تەنیا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك سەرخۆش دەبووەوە کە بەرەو شوێن خەوەکانی خۆیان دەبوونەوەو، ئەفسەرێکی فەرەنسی بە تورەییەوە داوای لێ دەکردن دەست لە هێرش هەڵبگرن و خەوەکەی لێ تێك نەدەن.



دوا نیوەڕۆیەك، دیکارت پاش ئەوەی وەك هەمیشە سووکە نانێکی بەیانی خوارد بڕیاریدا پیاسەی سەر شەقامەکانی شاری بردا بکات، ئاگاداریەکی سەردیوار سەرنجی ڕاکێشا، ئەوسا واباو بوو کە ئەو مەسەلە ماتماتیکیانەی حەل نەدەکران لە شێوەی ئاگاداریەکدا بە دیواردا هەڵدەواسران و ئەوانەی بەو ناوەدا تێ دەپەڕین بۆ حەل کردنی دەکەوتنە کێ برکێوە.

دیکارت زۆر سەری لە مەسەلەکە دەرنەکرد (چونکە بە زمانی هوڵەندی نووسرابوو) لە پیاوێکی بەڕێزی هوڵەندی پرسی کە لە پاڵیا وەستا بوو ئەگەر بتوانێت مەسەلەکەی بۆ وەربگێڕێت.

پیاوە هۆڵەندیەکە هێند نەکەوتە ژێر کاریگەری ئەو ئەفسەرە فەرەنسیە جوان و جەحێڵەوەو پێی وت ئەو تەنیا بە مەرجێك بۆی وەردەگێڕێت کە ئەو ئەفسەرە فەرەنسیە مەسەلەکە حەل بکات و وەڵامەکەی بهێنێتەوە بۆ ئەو، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، ئەفسەری لاو چوو بۆ ماڵی پیاوە هوڵەندیەکە، خانە خوێ زۆر سەری سووڕما، چونکە دیکارت نەك تەنیا مەسەلەکەی حەل کردبوو بەڵکوو شێوەیەکی زۆر داهێنەرانەیشی بۆ حەل کردنەکە بەکاربرد بوو.





بەقسەی ئادرین بایە، ژیان نامە نووسی دیکارت، پەیوەندی نێوان دیکارت و ئایزاك بیکمان، فەیلەسوف و ماتماتیك زانی هوڵەندی بەم جۆرە بوو، ئەم دوانە تا ساڵەکانی دوایی هاوڕێی نزیکی یەکتری بوون و بۆ ماوەی دوو دەیە بەردەوام نامەیان بۆ یەکتری دەنووسی (ئەگەر چی چەند جارێك لەسەر باسەکانی ماتماتیك پێکدا هەڵپژاون و پەیوەندیان پچڕیوە) جارێك دیکارت بۆ بیکمانی نووسی: "من خەوتبووم، تا تۆ هاتیت و خەبەرت کردمەوە" هەر ئەویش بوو کە پەیوەندی دیکارت بە ماتماتیك و فەلسەفەوە کە لەو کاتەوەی لافلشی جێ هێشتبوو بێدەنگ و خامۆش مابووەوە، سەر لە نوێ بە گەڕی خستەوە.

دیکارت دوای ئەوەی ساڵ و شتێکی لە سوپای هۆڵەندیدا بەسەر برد، سەفەرێکی هاوینەی بۆ ئەڵمانیاو بەڵتیك کرد،لەو سەفەرەدا، جارێکی تر بڕیاریدایەوە کە ژیانی سەربازی تاقی بکاتەوە. بۆیە سەفەری بۆ شارۆچکەی نوبورگ کرد کە دەکەوێتە باشووری ئەڵمانیاوە، لەوێ پەیوەندی بە سوپای ماکسیمیلیان، دوقی باڤاریا، کە ئۆردوی زستانەی خۆی لە کەناری باکوری دانوب دروست کردبوو کرد. وا دیارە ژیانی سوپایی لەو ناوچەیەیشدا وەك پێشوو بۆ دیکارت



ژیانێکی ناخۆش بوە. وەك دەنووسێت لە شوێنی گەرم و نەرمدا ژیاوەو، وەك جارانی دە سەعات خەو لە شەودا و بە ئاگا هاتنی لە نیوەڕۆدا وەك خۆی ماوەتەوە، لە کاتی بێداریدا لەگەڵ بیرو باوەڕەکانی خۆیدا لە خەڵوەت دابوە.

باری ئەورووپا وردە وردە بەرەو قەیران دەچوو، هەرچەندە ناتوانین لە ڕەفتاری دیکارتەوە ئەم ئەنجام گیریە بکەین، خەڵکی پاڤاریا دژی فەرەدریکی پێنجەم، فەرمان ڕەوای پالاتین و پاشای پروستانتی بوهم کەوتنە شەڕەوە، سەرتاسەری کەرتەی ئەورووپا بەرەو شەڕە درێژخایەن ومەینەت هێنەکان دەڕۆیشت کە پاشان بە شەڕەکانی سی ساڵە ناوی دەرکرد. ئەم شەڕانە کە ئەنجامی نادیاریان تەواوی وڵاتانی کەرتەکە لە سویدەوە بیگرە تا ئیتالیای گرتەوە و کاریگەریەکی زۆری خۆی هەبوو تا کۆتایی ژیانی دیکارت بەردەوام و گەلێك لە ناوچە فراوانەکانی ئەورووپا، بە تایبەت ئەڵمانیای ویران و نابودکرد. لەوە دەچێت کە کاریگەری ئەم شەڕانە لەسەر دیکارت، تەنانەت لەو کاتەیشدا کە لە ناو سوپادا بوە ئەوەندە بایەخی نەبوو بێت، هەرچەندە شیمانەی ئەوەیش هەیە کە ناسەقام گیری سیاسی ئەو سەردەمە، لەگەڵ نەبوونی دڵنیایی دەروونی خودی





دیکارت، بە جۆرێك لە جۆرەکان دەوریان هەبوو بێت لەو لایەنە قووڵەیدا کە بە دیهێنانی بن بڕی و یەقینە، کە ئەمە ڕووی هەرە دیاری سیستمە فەلسەفیەکەیەتی.

لەو کاتەدا زستانی ساردی باڤاریا زوو گەیشت و هەموو شوێنەکان بەفر داپپۆشین، هەوای ناوچەکە ئەمەندە بۆ دیکارت سارد بوو کە بڕیاریدا لە "ئاگردانێك"دا بژی، بە گشتی وا دێتە بەرچاو کە مەبەستی دیکارت لەم وشەیە ژوورێکی بچووك بو بێت کە گەرماکەی بەهۆی ئاگردانێکی ناوەڕاستی ژوورەکەوە دابین کرابێت و نموونەیشی لە ناوچەی پاڤاریادا زۆر بووبێت، بەڵام دیکارت لە یاداشتەکانیدا ئاشکرا دەنووسێت کە "لە ئاگردانێك"دا ژیاوە.

ڕۆژێك کە دیکارت لە ئاگردانەکەیدا دانیشتبوو، لەبیریدا وێنەیەك نەخشی بەست. ئەوە بە وردی ڕوون نیە کە دیکارت چی بینی، بەڵام لەوە دەچێت کە ئەو وێنەیە، وێنەیەکی شێوە ماتماتیکیانەی دنیا بێت، بەم جۆرە، دیکارت قەناعەتی بەوە هێنا کە بەهۆی ماتماتیکێکی دنیا گیرەوە دەتوانێت هەموو پەیوەندیەکانی دنیا بدۆزێتەوە، ئەو شەوە، کە دیکارت چوە ناو جێگاوە، سێ خەونی شەفاف بە زەینییدا گوزەری کرد، لە خەونی یەکەمیدا خۆی بینی کە لەگەڵ



ڕەشەبایەکی توندا لە شەڕدایەو هەوڵی ئەوەیەتی هەنگاو بەرەو قوتابخانە کۆنەکەی خۆی لە لافلش هەڵ بگرێت، لە چرکە ساتێکدا دەگەڕێتەوە تا هەواڵ پرسی لەگەڵ یەکێکدا بکات و لە ناکاودا بایەکە بە دیواری کڵێسایدا دەکێشێت، لەو کاتەدا لەناو حەوشی کڵێساوە دەنگێك بەرز دەبێتەوە کە هاوڕێیەکی دەیەوێت شووتیەکی بداتێ. لە خەونی دووەمدا، ترسێك هەموو گیانی دیکارت دادەگرێت و "دەنگێکی وەك هەورە بروسکە"ی دێتە بەر گوێ و پاشان هەزاران پزیسك ژوورەکەی ڕووناك دەکەنەوە. خەونی سێیەم زۆر ڕوون نیە. ئەو فەرهەنگێکی زمان و دیوانە شیعرێك لەسەر مێزەکەی خۆی دەبینێت، دوای ئەوە، ڕووداوێکی نەگونجاوو لە هەمان کاتدا ڕەمزیانە ڕوودەدات کە بۆ خودی ئەو زۆر شایستە و بۆ گوێ گر گەلێك ناخۆشە.

ئەوسا دیکارت (لە خەونەکەیدا) بڕیاردەدات هەموو ئەو ڕووداوانە ڕاڤە بکات، باس لەو ڕاڤەکردنانە دەشیا خۆناسینی دیکارتی بە چاکی ڕووناك بکردایەتەوە. بەڵام بەداخەوە، ئادرین بایە، ژیان نامە نووسی دیکارت، لەم لایەنەوە لە چەند ڕستەیەکی زۆر ئاڵۆزەوە سوود وەردەگرێت.





ڕووداوەکانی ئـەو ڕۆژە زسـتانیە و شـەوی دوایـی (١١ نۆڤەمبەری ١٦١٩) کاریگەریەکی زۆر قووڵ و پتەوی لەسەر دیکارت داناوە، خۆی لەو بڕوایەدا بووە کە ئەم خەون و وێنانەی کـە پاشـان لـە زەینـی ئـەودا دروسـت بوون پەیامێکی خوایی بوون و لە ئەستۆی ئەو نرابوون، بەم جۆرە، دیکارت وەك ئەرکی خۆی، هەروا بەو دەست کەوتانەی کە لە هەموو بوارەکاندا بەڵگاندنیان بەدەست نەهێناوە بڕوای پەیدا کرد، بڕوایەك کـە زۆر پێویسـتی پـی بـوو، ئەگـەر ئـەزموونی ئـەو ڕۆژە نەبوایـە، بلیمەتـە لاوەکەی ئێمە کە تا ئەو کاتە لەم چڵەوە دەپەڕیە سەر چڵێکی دی، هەرگیز پەیامەکـەی خـۆی نـە دەدۆزیـەوە، ئەمە جێی ڕامانـە کـە فەیلەسـوفێکی عـەقلانی گـەورەی وەك دیکارت لە وێنەیەکی خەیاڵی و چەند خەونێکی نا عەقلانی سروش وەربگرێت. ئەگەر چی ئەم لایەنەی بیری دیکـارت بـە شـێوەیەکی ئاسـایی لـە قوتابخانـەکانی فەرەنسـادا بایـەخی نادرێتـێ و ئـەم قارەمانـە گەورەیـە خـەیاڵ پـەردازە فەرەنسـاییە وەك نموونەیـەکی بەرجەستەی عەقلانیەت دەناسرێت.

پێویست بە وتن ناکـات کـە خەونـەکانی دیکـارت ڕاڤـەی جیاوازیـان بـۆ کـراوە، بـە بـڕوای فەیلەسـوف و ئەستێرە ناسی هۆڵـەندی، هویگنس، کە پاشـان لەگـەڵ



دیکارت نامەی گۆڕیەوە، ئەم خەونانەی وادایە قەڵەم کە لە ئەنجامی زۆر گەرم بوونی مێشکی دیکارتەوە بوە لەو کاتـەدا کـە لـە ئاگردانەکـەدا ژیـاوە. هـەندێکی تـر خەونەکانی دەدەنە پاڵ خراپی هەرس کردن، کارکردنی لە ڕادە بەدەر، کەم خەوی، ئەزموونی عیرفانی، تەنانەت پـەیوەندی کردنـی دیکـارت بـە کۆمەڵـەی روزیکروسینەوە[٣]، ئەمانە بـەهۆی سـەرەکی خەونـەکان دادەنێـن. شـووتی، کـە لـە پـەراوێزی خـەونی یەکـەمدا ئاماژەی بۆ کرا، بێگومان ئەوەی لە سەدەی هەژدەدا ژیان نامەی دیکارتی خوێندبێتەوە پێکەنینی پێ هاتوە. بەڵام بەسـەرهەڵدانی سـەردەمی پشـکوتنی زانسـتی دەرون شـیکاری ئـەو شـووتیە دەبێتـە بابـەتێکی جیـدی، نامەوێت لـەم بارەیـەوە زۆر باسی وردە کاریـەکان بکـەم، بەڵام ئاماژە بەوە دەکەم کە بە باوەڕی یەکێك لە خاوەن راکـان، فرۆیـد "ڕاڤەیـەکی یـەکجار زۆر نـا دروسـتی لـە بارەی شووتیەوە وەڕوخستوە".

لە ئەنجامی وێنەی زەینی و خەونەکانی ئەو رۆژ و شەوەوە، دیکارت سوێندی خوارد کە لـەوەو دوا هـەموو تەمـەنی خـۆی بۆ لێکۆڵینـەوەی فیکری تـەرخان بکـات و هەروەها بۆ سوپاس گوزاری بڕواتـە دیدەنـی پەرستگای خاتو لوریتـو لـە ئیتالیـا. بۆیـە جێـی سەرسـوڕمانە کـە





دیكارت پێنج ساڵی تریش لە ئەوروپادا بێ ئامانج و سەرگەردان بێت، دواییەكەی چوە دیدەنی خاتو لوریتوو، دوو ساڵی تریشی خایاند تا دەست بە لێكۆڵینەوەكانی بكات.

دەربارەی ئەم حەوت ساڵەی ژیانی دیكارت، كە خۆی ناوی "دەورەی سەر گەردانی" لێ ناوە، چ شتێكی ورد لە بەردەستاندا نیە، وا پێ دەچێت لە سەرەتای ئەو قۆناغەدا پەیوەندی بە سوپای شاهانەی مەجەڕستانەوە كردبێت، بەڵام شەڕەكانی سی ساڵە زۆر بە جیدی دەستی پێ كردبوو، دیكارتیش، ئەفسەری خانەدان، لە كارە سەربازیەكاندا چ شتێكی دیاری نەكردبوو، دوای ئەوەی سوپای بەجێ هێشت، سەفەری بۆ وڵاتانی فەڕەنسا، ئیتالیا، ئەڵمان، هۆڵەندا، دانیمارك و پۆڵۆنیا كرد، لە هەموو ئەوماوەیەدا، ئەو ناوچانەی كە هاوڕێ كاربەدەستەكانی تری بە شەڕی سی ساڵەوە سەرقاڵ كردبوو، بەپارێزێكی زۆرەوە پیایاندا تێ دەپەڕی، هەڵبەتە دیكارت هەموو جارێك لەو خۆ هەلاوێرد كردنەوەی لە زەبرو زەنگ سەركەوتنی بەدەست نەدەهێنا، جارێك كە بەسەفەر چو بوە یەكێك لە دوورگەكانی فریزین[٤] (ڕەنگە دوورگەی شیرمونیكوگ بێت) بەلەمێكی بەكرێ گرت تا لە دوورگەكەی دەربكات،



دەریاوانەكان بە بازرگانێكی فەڕەنسیان زانی و پلانێكیان بۆ دزینی شت و مەكەكانی دانا، كاتێك كە دیكارت لەسەر سەكۆی بەلەمەكە وەستا بوو، تەماشای كەناری دوورگەكەی دەكرد كە چۆن لە ئاوە شینەكەی دەریا دوور دەكەوتەوە، دەریاوانەكان بە زمانی هۆڵەندی پلانیان لە دژی دەكرد، نەخشەكەیان وادانا بوو كە بەسەریدا بكێشن و فڕێی بدەنە دەریاوەو ئەو ئاڵتونانەی بێگومان بوون لە جانتاكەیدا شاردوویەتیەوە ببەن بۆ خۆیان، بۆ نەگبەتی دەریاوانەكان، دیكارتی هاو سەفەریان كە دوای ساڵانێكی سەفەر كردن چەند وشەیەكی زمانی هۆڵەندی فێر ببوو، دەریاوانە نەگبەتەكان لە پڕێكدا كەوتنە بەر پەلاماری فەڕەنسایيە خانەدانەكە كە شمشێرەكەی لێ ڕاوەشاندن و بەرەو پێش و دواوە دەڕۆیشت و لە ئەنجامدا پیلانەكەیان سەرنەكەوت.

هەر لەو قۆناغەدا، دیكارت جارێكی دی دەشێ ساڵی ١٦٢٣ بوو بێت گەڕایەوە شوێنی لەدایك بوونی "لاهای"– و هەرچیەكی هەبوو فرۆشتی و پارەكەی خستە كارو چەند بەشێكی پێ كڕی، دەستكەوتی ئەمەندە زۆر بوو كە تا كۆتایی تەمەنی بەشی كرد. ڕەنگە باس لەوە بكرێت كە لەو سەفەرە دورو درێژەیدا،





دیكارت سەری لە خێزانەكەی داوە، بەڵام بەڵگەیەكی تەواو بۆ چەسپاندنی ئەم باسە لەبەر دەستدا نیە، دیكارت هەرگیز لەگەڵ خێزانەكەیدا ناكۆك نەبوە، بەڵام هەمیشە حەزی بەوە كردوە كە لێیان دوور بێت. لەگەڵ ئەو هەموو سەفەرەیدا كە ئازادانە لەسەرانسەری ئەوروپادا دەیكرد. هەرگیز ئەو زەحمەتەی نەدایە بەر خۆی كە بە بۆنەی زەماوەندی براكەی یان خوشكەكەیەوە سەر لە ماڵی خۆیان بدات و تەنانەت لەسەرە مەرگی باوكیدا ئامادەبێت.

لە كۆتایی ئەم قۆناغی سەفەرەدا، دیكارت ماوەیەكی زۆری لە پاریس بەسەر برد، لەوێ یەكێك لە هاوپۆلە كۆنەكانی قوتابخانەی لافلشی خۆی بینی كە ناوی مارین مرسان بوو و پەیوەندی بە كڵێساوە كرد بوو، باوكی مرسان پلەیەكی زانیاری بەرزی هەبوو، لەگەڵ گەورەترین بیرمەندانی ماتماتیك و فەلسەفە لە هەموو ئەوروپادا پەیوەندی هەبوو، مرسان لە ژوورێكی بچووكی خۆیدا لە پاریس لەگەڵ گەورە بلیمەتەكانی وەك پاسكال، فرما، گاسندی نامەی دەگۆڕییەوە، ژوورەكەی مرسان بە ڕاستی ببوە جێگای ئاڵ و گۆڕی دوا بیرەكانی ماتماتیك، زانستی و فەلسەفی. مرسان ئەو هاوڕێیە بوو كە دیكارت پێویستی پێ هەبوو، بۆیە تا كۆتایی تەمەنی



نامەی لەگەڵدا گۆڕیەوەو دەست نووسی بیرو بۆچوونەكانی خۆی بۆ دەناردو، بۆ ئەوەی دید و بۆچوونی مرسان چ لە بارەی بایەخی ئەو بیرو باوەڕانەوەو چ لە ڕووی دژایەتیانەوە لەگەڵ ڕێنماییەكانی كڵێسادا– بزانێت.

دیكارت زوربەی كاتی خۆی لە ژوورێكیدا لە پاریس بە خوێندنەوە بەسەر دەبرد، جارجارە هاوڕێكانی بۆ لێكۆڵینەوە دەربارەی كۆمەڵێك مەسەلەی جیاواز سەریان لێ دەدا، لە بارەی هەندێك مەسەلەوە دیكارت ناچار دەبوو لە ماڵەكەی دەربچێت و لە دانیشتنی ڕەسمی تردا بەشداری بكات. وەك دەڵێن جارێك كە دیكارت لە ماڵی سەفیری پاپادا ئامادە دەبێت، پزیشكێك بە ناوی شاندو لەبەردەم دانیشتوەكاندا قسە دەكات و دەیەوێت بنەمای "فەلسەفەی نوێ"ی خۆی بە ئامادەبوان بناسێنێت، دوای تەواو بوونی وتارەكەی دیكارت پشت ئەستوور بە كۆمەڵێك بەڵگەی وردی ماتماتیكی كەشاندو هیچ وەڵامێكی پی نەبوو، فەلسەفە نوێكەی ئەوی ڕەت كردەوە. (شاند و سێ ساڵ دوای ئەوە دیسان تووشی حاڵەتێكی وا بووەوە، بەڵام ئەمجارەیان تۆمەتبار كردنەكانی ئەو بەرجەستە تربوو لە ڕای فەلسەفی و پاشانیش لە سێدارە درا) كاردینال





دوبرول دوای ئەو بەڵگاندنە زیرەکانانە دیکارتی بردە گۆشەیەکەوەو جەختی ئەوەی لێ کرد کە هەموو تەمەنی خۆی بۆ فەلسەفە تەرخان بکات.

ئەم ڕووداوە کاری لە دیکارت کرد. هەڵبەت وێنە زەینییەکان و خەونەکانی لەوەو پێش وایان کردبوو کە دیکارت تەواو پشت بە خۆی ببەستێت، بەڵام لە کۆتاییدا ئاڕایێکی عەقڵانی پێویست بوو تا ناچاری کارکردنی بکات. لەساڵی ١٦٢٨دا دیکارت پاریسی بەجێ هێشت و ڕووی کردە باکووری فەرەنسا تا لە تەریکیەکی تەواودا خۆی بۆ بیرکردنەوە تەرخان بکات. وەلێ بەداخەوە هاوڕێکانی پاریسی هەر بۆ دیدەنیی دەچوونە لای، بۆیە بڕیاریدا بەرەو شوێنێکی دوورتر کۆچ بکات و بۆ ئەو مەبەستە چوو بۆ هوڵەندا تا تەواو تەنیا بێت.

دیکارت تا ساڵێك پێش مردنی، زیاد لە دوو دەیە هۆڵەندای بۆ نیشتە جێ بوونی خۆی هەڵبژارد.

هەڵبەت دەستەواژەی "نیشتە جێ هەڵبژاردن" ئەوەندەی پەیوەندی بە ژیانی دیکارتەوە هەبێت مانایەکی ڕێژەیی هەیە، بەپێی ئەو زانیاریانەی کە هەیە دیکارت لە پانزە ساڵی یەکەمی نیشتەجێ بوونی لە هۆڵەندەدا، بەلایەنی کەمەوە هەژدە جار ماڵەکەی



گۆڕیوە. تەنانەت هەر لەو سەردەمەدا، هەر کاتێك هەستی بێزاری بەرکی گرتبێت سەفەری بۆ دەرەوەی وڵات کردوە، تەنیا کەسێك کە بەردەوام بە وردی ئاگای لە دیکارت بوو بێت باوکی مرسان بووە، بەهەر حاڵ هیچ کەسێك تەنیاییەکەی لێ نەدەشێواند، ئەم جێ گۆڕکێ بەردەوامە تەنیا پەیوەندی بەوەوەیە کە دیکارت حەزی لە تەنیایی بوە، بەڵام وا پێ دەچێت کە لە پشت ئەم ماڵ بە کۆڵەوە بوونە بێقەراریەکی قووڵ خۆی حەشار دابێت.چونکە نە سەفەری زۆر و نە شوێن گۆڕین ناتوانێت بەیەکجاری تۆ لە خەڵکی دابڕێت تەنانەت ئەگەر دانەبڕانەکە زۆر ڕووکەش و ڕێکەوتیش بێت– ئەم شوێن گۆڕینە بێ کۆتاییە ئەوە دەردەخات کە دیکارت لەوپەڕی تەنیاییشدا هێشتا ئاسودە نەبوە. ئەو تەنیا بوو، بەڵام بێجگە لە پەیوەندیە هەرە ناچاریەکان نەی دەتوانی پەیوەندی خۆی لەگەڵ خەڵکیدا بهێڵێتەوە.

دیکارت هەمیشە لەماڵدا خزمەتکەری هەبوەو پێدەچێت مامەڵەیشی زۆر خۆش بوو بێت، ئێمە وا وێنای دیکارت دەکەین کە: خانەدانێکی ڕەنگ پەڕیو، بارۆکە لە سەرێکی قژی درێژو ڕەش کە لەو سەردەمەدا باو بوە، سمێڵ و ڕیشێکی تەنك و درێژ کە سەرنج ڕاکێشەرێکی نهێنی ئامێز بوو، دەڵێن مرۆڤێکی ڕێك





پـۆش بـوەو پـانتۆڵی کـورت و گـۆرەوی درێـژی ئاوریشمینی رەش و پێڵاوی نوقرەنیشانی لە پێ کردوە، هەمیشە شاڵێکی ئاوریشمینی لە ملدا بوە تا لە سەرمای بپارێزێت، کـە لـە مـاڵ دەڕۆیشـتە دەرێ، چاکـەتێکی ئەسـتوورو مـل پێچێکـی ئاوریشـمینی لەبـەردەکرد و هەمیشـە شمشـێرێکی بەقـەدەوە بـوو. دیکـارت بـە بچووکترین گۆڕانی ئاوو هەوا حەساسیەتی هەبوو، وەك خۆی دەیوت، سەرما بۆ ئەو لاوازیەی کە بە "میراتی بۆی مابووەوە" ئازاری بەسنگی دەگەیاند، بـەم حاڵـەوە، ئـەو سـاڵانێکی زۆری لـە تەمـەنی خـۆی بەسـەفەری هـەموو ئەوروپا، لە ئیتالیاوە تا ئەسـکەندەناڤی گوزەرانـد، دوا وڵاتیش کـە بـۆ نیشـتە جـێ بوونـی خـۆی هـەڵی بـژارد هۆڵەندا بوو کە بە باران، تەم و مژو سەهۆڵبەندانی زۆر ناوبـانگی دەرکـرد بـوو، یـەکێك لـە فەرەنسـیە هاوسەردەمەکانی دیکارت لە بارەی ئاوو هەوای ئەوێوە وتوویـەتی "چـوار مـانگ زسـتان و دوای ئـەوە هەشت مانگ سەرما".

لەگەڵ ئەمەیشدا، هۆڵەندا تایبەتمەندیەکی گەورەی هـەبوو، لەسـەدەی حـەڤدەی زایـندا، ئـەم ناوچەیـەی ئەوروپا بـە مەڵبـەندی ئـازادیی بـیروڕا نـاو بـراوە. بـە پێچەوانەی وڵاتەکانی ترەوە، لە هۆڵەندا دا هیچ کەسێك



باجی لەسەر بیروباوەڕی خۆی نەدەدا، هۆڵەندیەکان لێك بوردوبـوون، میانەیـەکیان لەگـەڵ سانسـۆرکردنی بـیرو باوەڕ، بە کافر کردن و سوتاندنی خـاوەنی بـیر نـەبوو ئەمانـە تایبەتمـەند گـەلێکی گرنـگ بـوون کـە بیرمـەندە تازەکـانی لەسەرانسـەری ئـەوروپاوە بـۆ هۆڵـەندا کێـش دەکرد– لە نێو چوار بیرمەندی مـەزندا کـە لـە سـەدەی حەڤدەهـەمدا بـیری فەلسـەفی نوێیـان هێنایـە ئـاراوە، سـیانیان دیکـارت سـپینۆزا ولاك ماوەیـەکی تەمـەنیان لـە هۆڵـەندەدا بەسـەر بـرد (چـوارەم بیرمـەند، یەعنی لایبانیتس لە نزیکی سنووری هۆڵەندا لە هانۆڤەر دەژیا و چەند جـارێك سـەفەری هۆڵـەندای کـرد) و هـەر لەبـەر ئـەم دۆخـی ئـازادی فیکریـە بـوو کـە تاڕادەیـەك هۆڵەندا بوو بوە مەڵبەندێکی گرنگی پیشەسازی چاپ و بەرهـەمی گـەورە پیـاوانێکی وەك گـالیلۆو هـابز لـەوێ چـاپ کـران، لـەو قۆناغـەدا، هیـچ شـوێنێکی ئـەوروپا بـە ئـەندازەی هۆڵـەندا شـایەتی سـەرهەڵدانی هزرە تازەکان نەبوو.

دیکـارت ئـەو قۆناغـە بـە پیتـەی ژیـانی خـۆی بـە ئومێدەواریـەکی زۆرەوە دەسـت پـێکرد، لـە ئـەنجامی خەونـەکانیدا کـە لـە ئاگردانەکـەی باڤاریـادا بینیبـووی بیری زانستێکی سەراپاگیری لەسەریدا گەڵاڵە دەکرد تا





هەموو زانستە مرۆڤیەتیەکان بگرێتەوە. ئەم زانستە لە دەیتوانی بەسوود وەرگرتن لە عەقڵ ڕێگای پەی بە حەقیقەت بردن بسازێنێت.

ئەم زانستە شتێك بوو زیاد لە میتۆدی تازەو شۆڕش. (لە زانستی کیمیاگەری سەدەکانی ناوەڕاستا، عەقڵ دەورێکی زۆر لاوەکی هەبوو) دیکارت سیستمێکی لە زەینی خۆیدا پەروەردە دەکرد کە نەك تەنیا هەموو زانستی مرۆڤایەتی لە خۆ بگرێت، بەڵکوویەکیان پێ بگرێت، ئەو سیستمە دووربوو لەهەر حوکمێکی پێشینەو گریمانەیەکی بەرایی و تەنیا لەسەر بنەمای یەقین رادەوەستا. دیکارت لەبەدیهێنانی ئەم سیستەمەدا کارەکەی خۆی لەو بنەما سەرەکیانەوە دەست پێ کرد کە بەڵگەنەویست بوون و پێویستیان بە سەلماندن نەدەکرد و لەسەر ئەو بنەمایانەوە سیستمەکە دروست دەبوو.

دیکارت پێش بینی ئەوەی دەکرد کە لە سیستمە فەلسەفیەکەی زۆر کەڵك وەربگیرێت. ئەو بە دڵنیاییەوە پێش بینی ئەوەی کرد کە هەرکاتێك ئەم میتۆدە زانستیە تازەیە لە زانستی پزیشکیدا پەیرەویی لێ بکرێت، دەتوانێت پرۆسەی پیربون دوا بخات. (ئەمە خەونی هەمیشەیی دیکارت بوو، دوای دەساڵ، بۆ بیرمەندی



هۆڵەندی، هویگنسی نووسی کە لەگەڵ ئەوەیشدا خۆی لەش و لارێکی لەڕو لاوازی هەیە، بەڵام وای بۆ دەچێت کە تەمەنی زۆر زیاد لە سەد ساڵ تێ بپەڕێت. هەرچەندە لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا بە ناچاری لەم ڕایەی پەشیمان بووەوە چەند ساڵێکی لە پێش بینیەکەی خۆی کەم کردەوە).

دیکارت دەستی بە نووسینی کتێبی (لەبارەی ڕێسای رابەری زەینەوە[٥]) کرد، بە مەبەستی دۆزینەوەی زانستێکی جیهانگیر، دەبوو سەرەتا میتۆدێکی بۆ بیرکردنەوەی ڕاست بدۆزیایەتەوە، ئەم میتۆدە لە ڕاستیا بریتی بوو بە لەبەرچاوگرتنی دوو ڕێسا لە پرۆسەی زەینی مەزەنەو ئەنجام گیری (شهود و استنتاج)، دیکارت مەزەنەی بەم جۆرە پێناسە کرد، (تێگەیشتنی دوور لە ڕاڕای زەینێکی ڕووناك و هوشیار کە ئەمەیش تەنیا لەبەر تیشکی عەقڵدا بەدەست دێت) پێناسەی ئەنجام گیریشی بەم جۆرە کرد (ئەنجام گیریەکی پێویست لەو حەقیقەتانەی کە گومان لە ڕاستییان ناکرێت) میتۆدی سەرەکیی دیکارت کە پاشان بە میتۆدی دیکارتی ناوبانگی دەرکرد[٦] لەچاك بەکارهێنانی ئەم دوو ڕێسا فیکریە دا پوخت دەکرێتەوە.





ديكارت لە زەمينەی مەسەلە جۆراو جۆرەكانی فەلسەفەو زانستدا تا دەهات ناوبانگی زياتر پەيدا دەكرد، لە مارتی ساڵی ١٦٢٩دا، پاپاو هەندێك لە كاردیناڵە گەورەكان سەرنجی ئەوەیاندا كە هەندێك تەنی نەزانراو بە ئاسمانی رۆماوەن. لەتەك خۆراوابووندا، خەرمانەيەكی ڕوناكی لە ئاسماندا دەردەكەوت كە كۆمەڵێك نوختەی درەوشاوە بەدەوریدا دەسوڕان. چەند نامەيەكيان بۆ دیكارت و هەندێك لە بیرمەندانی ناودار نارد تا بیروڕای خۆیان لەو بارەیەوە دەربڕن.

ديكارت بەجۆرێك ئەو مەسەلەيە ڕايكێشا كە بۆ ماوەيەك بيركردنەوە فەلسەفيەكانی خستە لاوەو كەوتە دوای ئەو باسە. ئەو دەربارەی هۆی دەركەوتنی ئەو جۆرە دیاردانە گەیشتبوە بیرو باوەڕێك كە بڵاو كردنەوەی تا چەند ساڵێكی دوایی دواكەوت، لەوكاتەدا، ديكارت كتێبێكی تەواوی لەبارەی دیاردە ئاسمانیەكانەوە نووسی. (لەو ماوەيەدا، كڵێسای ڤاتیكانیش تیورەیەكی بەدەست هێنا بوو، گوایا هۆی دەركەوتنی ئەو دیاردانە ئەو فریشتانە بوون كە ئاسمانیان بۆ دوەم گەڕانەوەی حەزرەتی مەسیح ئامادە دەكرد) ديكارت بڕوای وا بوو كە ئەو ڕوناكيانەی ئاسمان بە هۆی تیشکە بەردینەکانەوە دروست دەبن، بە



داخەوە، ڕووناكبیرانی سەردەمی نوێ هەندێك ڕوناكیان خستە سەر دەركەوتنی ئەو دیاردانە كە تەنانەت لە تیورەكانی ڤاتیكان نامەنتیقی تر بوون. ئێستا ئەو دیاردانە بە خۆرە درۆینەكان[٧] ناسراون. بەپێی تیوری نوێ ئەو دیاردانە کاتێك دەردەكەون كە ڕووناكی خۆر لە نێو هەورێكی ئەستوورەوە هەڵبێتە سەر زەوی، هەورەكە لە شێوەی چەند بلورێكی بەستووی شەش ڕوو پێكهاتووە كە تەوەری هاوبەشی ڕووەكان شێوەيەكی ستوونی هەیە. ئەمڕۆ زیاتر شیمانەی ئەوە هەیە كە لە كاتێكدا ئەو بلوورە بەستوانە لە ئاسماندا خەریكی دروست بوونن ئەو دیاردانە دەردەكەون و ئیتر چ پەیوەندیەكی بە فریشتەوە نیە، هەروەها ڕوون كردنەوە سادەكانی لە بابەتی ئەوانەی دیكارتیش زۆر بەهەند وەرناگیرێت.

لە ئەستێرەناسیشدا، وەك گەلێك مەسەلەی دی، دیكارت شایەتی سەردەمێكی كورت و، ڕەنگە بێ وێنە بێت لە بیركردنەوەكانی مرۆڤدا، ئەو ڕوون كردنەوە تازانەی كە بیرمەندە ورد كارەكانی بواری زانست و فەلسەفەی ئەو سەردەمە بۆ مەسەلە جیاوازەكان دەیان كرد، لە زۆر لایەنەوە، هەم مەنتیقی و هەم قابیلی تێگەیشتن بوون، هەروەها زۆربەی ڕوونكردنەوەكان





بنەمایەکی عەقڵیان هەبوو کە دەرك پێ کردنیان ئاسان بوو هەر بەم ئامانجەوە دەخرانە ڕوو کە ڕێگا بۆ ئاڵۆزترین نهێنیەکانی دنیا بکاتەوە. تاقیکردنەوەی سەردەمێکی وا بۆ مرۆڤایەتی جارێکی تر دوورە دەستە.

لەو سەردەمە بەدواوە، دەرك کردنی هەقیقەت بەردەوام دژوارو دژوارتر بوە. مەگەر لە بوارێکی تایبەتی دیاری کراودا کە کەسێکی بە توانا ئەو دەرکەی کردبێت، لەو ساوە تا ئێستا، ئەو زانیاریانەی کە بە دەستمان هێناوە لە بارەی کۆمەڵێك مەسەلەوە کەمو کەمتر بوەتەوە.

دیکارت دوای لێکدانەوەی کاری ڕێسا زەینییەکان، ڕووی لە دنیای دەرەوە کرد. بەم جۆرە لە ماوەی سێ ساڵدا **باسێك لە بارەی دنیاوە**[٨] ی نووسی. ئەم باسە کۆمەڵێك بیرو باوەڕی ئەوی لە خۆ گرتووە کە لە بارەی بابەتی زانستی جۆراو جۆرو فراوانی وەك تیشکە بەردینەکان، روناکی ناسی و ئەندازەوەیە، دیکارت بۆ پەرەپێدانی لێکۆڵینەوەکانی لە زەمینەی زانستی توێکاری (ئاناتومی)دا بڕیاریدا سەر لە قەسابخانە ناوچەییەکان بدات، نموونەی جیاوازی لە ئەندامەکانی لەشی ئاژەڵ لەژێر جلەکانیەوە دەشاردەوە و دەیبردە



ماڵێ، بۆ ئەوەی بی ئەوەی سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت بکەوێتە توێکاریان، لە ئەنجامدا ئەو لێکۆڵینەوانەی لێ کەوتەوە کە دەربارەی زانستی کورپەلەزانی نووسینی (ئەفسانەیەك لەم بارەیەوە دەگێرنەوە کە ڕۆژێك دیکارت لە قەسابخانەیەکدا لاوێکی بەخۆوەی بینی کە نیگاری پێستەی گایەکی دەکێشا، دیکارت لە لاوەکەی پرسی هۆی چیە بابەتێکی وای هەڵبژاردوە، نیگارکێشەکە وەلامی دایەوە: "فەلسەفەکەی تۆ ڕۆح لە مرۆڤ دەستێنێت، منیش بە نیگارەکانم ئەو ڕۆحە دەبەخشمەوە، تەنانەت بە ئاژەڵی مردوویش" دەڵێن ئەو هونەرمەندە لاوە هەمان رامبرانت بوە.

دوای سێ ساڵ تێکۆشانی خەست، دیکارت بڕیاریدا بەرگی یەکەمینی باسێك لە بارەی دنیاوە بۆ باوکی مرسان بنێرێت تا لە پاریس چاپی بکات. بەلام لەپڕێکا هەواڵێکی چاوەڕوان نەکراوی سەیری لە ڕۆماوە بەر گوێ کەوت، گالیلو بە کافر تاوانبار کراوەو، دراوەتە دادگای پشکنینی بیرو باوەڕو ناچار بوە کە سوێند بخوات چالاکیە زانستیەکانی خۆی بخاتە لاوە و نەفرەتیان لێ بکات. ئەم بە زۆر سوێند پێ خواردنەی گالیلۆ زیاتر لەسەر ئەوە بوو کە ئەم بڕوای بە تیورەکەی کۆپەرنیکۆس هەبوو کە زەوی بە دەوری خۆردا





دەسوڕێتەوە. دیکارت پەیتا پەیتا داوای لە بیکمان-ی هاوڕێی کرد کە نوسخەیەکی لە کتێبەکەی گالیلۆ بۆ بنێرێت، زۆر بە نیگەرانیەوە لەوە گەیشت کە گەلێگ لە ئەنجامگیریەکانی گالیلۆ لەو ئەنجامگیریانە دەچن کە ئەمیش بە دەستی هێناون.

دیکارت بێ ئەوەی لەو بارەیەوە بەکەسێك بڵێت باسێك لەبارەی دنیاوە-ی کەلا خست و بیری خۆی بە مەسەلە گەلێکەوە خەریك کرد کە کەمتر وروژێنەر بوون (باسێك لە بارەی دنیاوە تا سالانێکی دوای مەرگی دیکارت بلاونەبووەوە، ئەوسایش تەنیا هەندێکی لێ بلاوکرایەوە)

ژیانی دیکارت پڕە لە دژایەتی جۆراوجۆر، ئەو حەزی بەوە بوو بەهێوری لە تەنیاییدا بژی، کەچی هەر ئەو تەنیاییە ناچاری دەکرد کە هەمیشە لە سەفەر کردندا بێت، وەك بیرمەندێکی ئازاو نوێخواز سوێندی خواردبوو کە بیرو باوەڕەکانی تا کوێ بڕ بکات بە دوایانەوە بێت، کەچی هەر لە هەمان کاتدا وەك ئینسان سوێندی خواردبوو کە پەیڕەوی لە یاساکانی وڵاتەکەی خۆی بکات، وەفادار بێت بە ئاینی باووباپیرانی، پەیڕەوی لە بیری عاقڵترین کەس بکات کە دەیناسێت، دیکارت بڕوای وابوو ئەوەی لە باسێك لە بارەی دنیاوە



نووسراوە ڕاستە. کەچی لە هەمان کاتدا بڕوایەکی پتەوی بەخوای کڵێسا هەبوو، دیکارت تۆمەتی ترسنۆکی دەخرێتە پاڵ و دەیشڵێن لە ژێرەوە گومڕا -ملحد- بوە. لەگەڵ ئەوەیشدا کە ڕامانی زۆری لەسەر لایەنی دەروون هەبوە. کەچی هێشتا لەبارەی بوونی خۆیەوە ناسینێکی تەواوی نەبوە، بەڵام هیچ یەکێك لەم تۆمەتانەی شیاوی ئەوەنین بەرگریان لێ بکرێت، دەشێت دیکارت لە گرووی قارەمانان نەبووبێت، بەڵام ئەمە بەمانای ترسنۆکی ئەونیە، ئەو بەوە قایل بوو کە کڵێسا دەتوانێت لەگەڵ پاراستنی بیرو باوەرە قوتابخانەییەکەی خۆیدا، لەگەڵ بیرو باوەڕی نوێی ئەمدا یەکانگیر بێت، خۆناسینیشی لەسەردەمی سوکراتەوە بیگرە لەهەر فەیلەسوفێکی دی قووڵتر بوە، هەرچەن لایەنێکی تاریك لەبارەی دەروون ناسیەوە لەو خۆناسینەدا بەرچاو دەکەوێت.

بەم جۆرە، دەبێت گرنگترین دژایەتی لە خودی فەلسەفەی دیکارتا پەیدا بکرێت. دیکارت دنیا بە دوو جۆرە جەوهەر دادەنێت زەین و مادە. زەین جەوهەرێکە قبووڵی درێژبوونەوەو دابەشبوون ناکات، بەرانبەر بەم، مادە هەم درێژبوونەوەی هەیە و هەم دابەش بوون و پەیڕەوی لە یاساکانی فیزیك دەکات، بە وتەیەکی دی،





زەینی نامادەی ئێمە لە جەستەیەکی میکانیکیدا سەقامگیرە، بەڵام چۆن زەین، کە توانای درێژ بوونەوەی نیە، دەتوانێت لەگەڵ جەستەدا کە پاشکۆی یاساکانی زانستی میکانیکە پەیوەندیەکی بەرانبەر دروست بکات؟ هەرگیز دیکارت وەڵامێکی قایل کەری ئەم پرسیارەی بۆ نەدرایەوە- پرسیارێك کە بە شێوەیەکی سەیر ڕەنگدانەوەی دژایەتی دەروون شیکاریەکانی خۆیەتی کە ژیانی ڕۆژانەی ئەوی ناخۆش دەکرد. بەڵام، وەك هەمیشە هەوڵیدا ئەم پرسیارە بێ وەڵام نەهێڵێتەوە، بە بۆچوونی دیکارت، شوێنی پێك گەیەشتن و کاریگەری هاوبەرانبەری زەین و جەستە لە ڕژێن (غودە)یەکی پشتەوەی مێشکدایە (ئەندامێکی سەیر کە کەوتۆتە پشتەوەی مێشکەوەو دەوری کاریگەری تا ئەمڕۆ لای ئێمە هەر بە نهێنی ماوەتەوە) بەداخەوە دیکارت لێرەدا لە باسە سەرەکیەکە لایداوە، پرسیاری سەرەکی ئەوە نیە کە زین و جەستە لە کوێدا پێك دەگەن، بەڵکوو پرسیارەکە ئەوەیە کە ئەم دوانە "چۆن" پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا دەبەستن.

لەم بەشەی ژیانی دیکارتا، ڕووداوێکی عاتیفی وای دێتە پێشێ کە شتی لەو بابەتە و بۆ ژیانی ئەو زۆر دەگمەنە. دیکارت لەگەڵ کچێك کە لەوە دەچێت



کارەکەری بو بێت بە ناوی (هیلن) پەیوەندی دەبەستێت، بەرهەمی ئەو پەیوەندیە کچێکە بە ناوی فرانسین- دوای لەدایك بوونی فرانسین، هیلن لەگەڵ کچەکەیدا لە نزیك ماڵی دیکارتەوە نیشتە جێ دەبێت و بەردەوام دەی بینێت، لەبەردەمی خەڵکدا دیکارت فرانسین وەك خوشکەزای خۆی دەناسێنێت.

بەو مەدرەکە کە مانەوە کە لەبەر دەستدایە ناتوانین بەوردی پەیوەندی نێوان دیکارت و هیلن دیاری بکەین، بەڵام دەتوانین لەو بارەوە پەی بە هەندێك شت بەرین. هیلنی بێچارە چۆن توانی سەرنجی ئەم پیاوە خانەدانە خوێن ساردە بەلای خۆیدا ڕابکێشێت؟ لە نیگای ساردو چاوی بەقوڵاچوویدا ئەم ژنە چ شتێکی دەستگیر دەبوو؟ ڕەنگە هیلن هێند سەرکەوتوو نەبووبێت لە سەرنج ڕاکێشانی دیکارت بۆ لای خۆی، وەلێ گومان لەوەدا نیە کە لەو ڕووەوە فرانسین زیاتر سەرکەوتوە. کچۆڵەکە ڕاستگۆیانە دەستی بۆ لای باوکی درێژ دەکرد و ئەویش وەڵامی خۆشەویستیی کچەکەی خۆی دەدایەوە. (ڕەنگە بە بینینی کیژۆڵەکەی یادی منداڵی خۆی کەوتبێتەوە کە بە تەنیا ئازادی درابوو بەو و بێجگە لە لەلە پیرەکەی کەس چاودێری نەدەکرد) ئەگەرچی لە سەرەتادا دیکارت دەیویست فرانسین وەك خوشکەزای خۆی بە خەڵکی





بناسێنێت، بەڵام زۆر زوو دڵ بەستەی کچەکەی بوو، ئەم ئەزموونە عاتیفیە لە ژیانی دیکارتا بێ وێنە بوو.

لەوماوەیەدا دیکارت دەستی کرد بە نووسینی باسێك کە تا ئێستایش بە ناوازەترین بەرهەمی ئەو دادەنرێت. ئەویش باسێکە بە ناوی (باسێك لە بارەی میتود)ەوە. سەیر ئەوە بوو کە ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم کتێبە چەند بەشێکی لە (**باسێك دەربارەی دنیا**)ی پێك دەهێنا، ئەو بەشانەی کەمتر مەترسیان لێ دەکرا، زوربەی مەبەستەکان ئەوەیان بوو کە رووی ماتماتیکی دەگۆڕی و پێشکەوتنێکی گرنگی لە زانستا بەدی دەهێنا. لەم کارەدا دیکارت بنەماکانی ئەندازەی شیکاری نوێی خستە بەرچاوو تەوەرە تایبەتەکانی ناساند (کەپاشان لایب نیتس بە دەزگا تایبەتیەکانی دیکارتی ناونا)لە زەمینەی روناکی ناسیەوە، دیکارت یاسای شکستی روناکی خستە ڕوو، هەروڵیدا هۆی دروست بوونی پەلکەزێرینە روون بکاتەوە. هەروەها دیکارت تێکۆشا تا تیوری زانستی و عەقڵانی بۆ باری ئاوو هەوا بخاتە روو (کە لە دواییدا وەك تیورە تازەکانی کەش ناسی لەبەردەم ئەو تێکۆشانانەدا کە بۆ ئەم دیاردەیە قبووڵی پێش بینی کردن و نایاسایی ناکەن شکستی خوارد).



بەڵام بێ دوو دڵی، باشترین بەشی (باسێك لە بارەی میتۆد)ەوە، ئەو پێشەکیەیەتی کە تا ڕادەیەك کورتە، ئەو پێشەکیە هێڵە سەرەکیەکانی بیری دیکارت بوون کە ڕێڕەوی فەلسەفەیان گۆڕی، لەم پێشەکیەدا دیکارت بە بزاڤێکی ڕیشەیی لە شتە سونەتیەکان دووردەکەوێتەوە، ئەم بیرو ڕایانە وا دادەڕێژێت کە قابیلی تێگەیشتن و قابیلی خوێندنەوە بن. چۆن دەتوانرێت روانینە قووڵ و داهێنراوە فەلسەفیەکان ئەمەندە روون و ئاشکرا بکرێن کە هەموو کەسێك بتوانێت دەرکیان بکات و لێیان تێ بگات؟ ئەم کێشەیە نەك تەنیا من و ئێوەی زۆر جار بەگیر هێناوە. بەڵکو گەورەترین مێشکە فەلسەفیەکانی جیهانیشی گرفتار کردوە. ئەفلاتوون بۆ نەهێشتنی ئەم گرفتە فەلسەفەکەی خۆی لە شێوەی گفت و گۆدا دەربڕی، نیچە وای بیردەکردەوە بەهۆی درەوشاوەترین، جوانترین و بە تواناترین پەخشانێکەوە کە بە زمانی ئەڵمانی نووسراوە ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکات. هەر ئەو خۆ بە گەورە زانینەیش بوو کە لە دواییدا بەرەو شێتیەکی تەواوی برد. ڤیتگنشتاین تێکۆشا کە ئەم مەسەلەیە بە لەبەرچاوگرتنی کورت گەرایی وەرگران (مخاطبان)ی سەردەمی تەلەفزیون چاربکات و بیرو ڕاکانی خۆی لە





شێوەی چەند ڕستەیەکی دوو سێ خەتیدا دەربڕێت. بەڵام ئەم شێوازەیش جێگای بۆ باس و بەڵگاندنی فەلسەفی نەدە هێشتەوە، شێوازی دیکارت بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. لە هەموویان ئاسان و سادەتر بوو، ئەو لەو پەخشانە شەفافەدا کەلە نووسینی ژیان نامە دەچێت، ئەوەڕوون دەکاتەوە کە چۆن چۆنی دەکەوێتە بیرکردنەوەوەو لەم پرۆسەیەدا چەند بیری جۆراو جۆر لە زەینیدا دروست دەبێت، لە خوێندنەوەی کاری دیکارتدا، ئەوە دەردەکەوێت کە زەینێکی گەورە چۆن بیری فەلسەفی ڕەسەن بەرهەم دێنێت، دیکارتیش هێند بە جوانی وەسفی ڕێبازە فیکریەکەی خۆی دەکات کە خوێنەر تەفرە دەخوات و وا دەزانێت کە ئەم کارە زۆر سادەیەو، ئەو میتودەی کە ئەو باسی دەکات لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی ئێمەدا هێند جیاوازی نیە، ئەو خوێنەرانی فەلسەفەکەی هەنگاو بە هەنگاو بەشێوەیەکی عەقڵی بەرەو ئەو ئەنجامگیریانە دەبات کە خۆی مەبەستیەتی.

دیکارت باسی بیرو باوەڕەکانی خۆی بە گەڕانەوە بۆ سەر زەمینی بەفر گرتووی باڤاریا و ئەو وێنەیەی کە لە زەینی ئەودا نەخشی بەستوە دەست پێ دەکات "زستان هات و منیش خۆم لە نوختەیەکدا دۆزیەوە کە



هیچ دیدارێك سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕانەدەکێشا، لەو کاتەدا. من لە هەموو نیگەرانی و هەراو زەنایەك بەدوور بووم، بۆیە هەموو ڕۆژەکەم لە ئاگردانێکدا بەسەر دەبردو دەمتوانی لەگەڵ بیرەکانی خۆمدا تەنیابم" پاشان بە پەخشانێکی زۆر خوێن ساردانە باس لەوە دەکات کە چۆن دەتوانرێت بە کەڵك وەرگرتن لەو شێوانەی بە دوای یەکتریدا دێن و ئامانجێکی دیاری کراویان هەیە هەموو بیرو باوەڕەکانمان دەربارەی دنیای دەوروبەرمان لەبەریەك هەڵوەشێت، هیچ شتێك، بە بێ بریو سەلماوی نامێنێتەوە، هەموو دنیا، تاکایەتی خودی ئێمە، تەنانەت بنەمای وجودمان دەشێت لە خەونێك زیاتر هیچی تر نەبێت. بۆ ئەوەی یەقین بەشتێك پەیدا بکەیت هیچ ڕێگایەك نیە، دەبێت تەنیا بڕوات بەیەك شت هەبێت، گرنگ نیە لە بیرکردنەوەی مندا کە دەربارەی خود یان دنیای دەوروبەرم هەمە تا چ ڕادەیەك گومڕام، تەنیا هەقیقەتێك بوونی هەیە کە قابیلی نکولی لێ کردن نیە! **من بیردەکەمەوە**. تەنیا ئەم حەقیقەتەیە کە دەتوانێت بوونی ئێمە بسەلمێنێت، لە دیارترین زاراوەی مێژووی فەلسەفەدا دیکارت وا ئەنجامگیری دەکات! **من بیردەکەمەوە، کەواتە هەم**.





دوای بەدی هێنانی ئەم تەنیا ئەنجامگیریە یەقین و سەلماوە دیکارت هەموو ئەو هەقیقەتانەی کە پێشان گۆمانی لێ کردوون لەسەر بنەمای ئەم ئەنجامە تازەیە دروستی دەکاتەوە. دنیا، هەقیقەتەکانی ماتماتیك، زستانی بەفرینی باڤاریا هەموویان بە یەقینێکی ساردەوە دەگەڕێنەوە. بەڵام ئەمجارەیان دوای بەسەر چوونی قۆناغی خۆ دوورخستنەوە بۆ سەرزەمینی گومان و دوو دڵی، زیاد لەهەر سەردەمێکی دی گومان هەڵگیر نین. چونکە لەسەر بنەمای هەقیقەتێك داڕێژرا بوون کە هەرگیز گومان هەڵنەگر نەبوون.

دیکارت کە لەو پەیامەدا، ئازایانە دەربارەی هەموو دنیا بانگەشەی گومانی کردبوو. بڕیاریدا بێ ناوهێنان چاپی بکات. هەروەها، زمانی فەرەنسی بۆ باسەکەی هەڵبژارد تا زۆرترین خوێنەر ڕابکێشێت. ئەو خۆی لە هەموو جۆرە شەڕێکی کڵێسا دەپاراست، ئومێدەواریش بوو لەگەڵ ئەوانەدا کە پەیوەندیان لەگەڵ زانستی تازەدا هەبوو بەو ئامانجە بگات. زۆر سەیر ئەم پێش دەستیە سەری گرت. خەڵکی زۆر زوو کتێبی -**باسێك لە بارەی میتود**-ەوەیان ناسی، بەڵام سەرەتا زیاتر پەیوەندی خۆیان لەگەڵ تیورە ماتماتیکی و زانستیەکانیدا دەرخست.



ماتماتیك زانەکان لە سەرەتاوە زۆر سەرسام و پاشان تووڕە بوون.

لە گۆشە نیگای زوربەی ئێمەوە، سەلماوترین مەبەست دەربارەی ماتماتیك ئەوەیە کە ئەنجامە ماتماتیکیەکان یان ڕاستن یان هەڵە. بیرکردنەوەیەکی وا سادە بە تەواوی مرۆ لە گرووی ماتماتیك زانە ڕاستیەکان دەردەهاوێت، کاتێك بگەینە ئاستی بلیمەت و گەورە ماتماتیك زانەکان، ئیتر دابەش کردنی بابەتی و سادە لەوحانەی مەسەلەکان بەسەر ڕاست و هەڵەدا جێگای خۆی بۆ ئاقارێکی بیرمەندانەترو مل ملانێ کەرتر چۆڵ دەکات، چەندە ئەم ئاقارەیش لەگەڵ هەقیقەتە گومان هەڵنەگرەکاندا کە قابیلی نکوولی لێ کردن نین ڕووبەڕوو بێتەوە، ململانێکەیش (بە بەرزبوونەوەیەکی ئەندازەیی) زیاد دەکات. دوای لێکۆڵینەوەی تیورە ماتماتیکیە نوێکانی دیکارت و دیاری کردنی داهێنانە قووڵەکانی، هەموو ماتماتیك زانە گەورەکانی ئەو سەردەمە زوو چەکەکانیان لە ڕووی دیکارتدا بەرزکردەوە. گاسندی، پاسکال، ئینسن، فرما و... یەك بە دوای یەکدا هاتنە ناو مشت و مڕەکەوە، مشتومڕی نێوان ئەمانە لەوە گەورەتر بوو کە مرۆڤی خاکی دەرکی بکات. ئەو کەسەی لەم بارەیەوە بیرو باوەڕی تری هەیە، بۆی هەیە بەسەرهاتە





كۆنەكەی دوایین مەسەلە (كێشە)ی فرمایان بە كەڵك و فێركارانە بێت، بە پێی ئەم مەسەلەیە، هیچ ژمارەیەكی راست و بالآتر لە ژمارەی (یەك) بوونی نیە، كە ئەم عیبارەتەی خوارەوەی بۆ ڕاست بێت:

$$X^n + Y^n = Z^n$$

**فرما** كەمێك پێش مردنی لە پەراوێزی ئەم ڕاپسایەدا نووسی: "من شێوازێكی چاكم بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە دۆزیەوە، بەڵام ئەم لاپەڕەیە جێگای تەواوی بۆ نووسین تیا نەمابووەوە" لەگەڵ هەوڵی بەردەوامی بەرجەستەترین ماتماتیك زانانی سێ سەدەی پێشوو، تا ئێستا هیچ كەسێك نەیتوانیوە ڕاستیی یان هەڵەی دوا مەسەلەی فرما بسەلمێنێت. هەندێك بڕوایان وایە كە دەشێت ئەم مەسەلەیە ڕاست نەبێت، بەڵام هەندێكی تر بە ڕاستی دەزانن، هەندێك لایان وایە كە فرما لە ڕاستیا لافی لێداوە، تەنانەت هەیە دەڵێت كە ئەو توانای سەلماندنی نەبوە.. ماتماتیك بە یەقین دەست پێ دەكات و بێرە كۆتایی دێت. بەڵام فەلسەفە لێرەوە دەست پێ دەكات و هەر لێرەیشدا كۆتایی دێت. كە دەڵێن كەسێك دیدی فەلسەفی هەیە، دەبێت لەوە دڵنیا بیت كە ئەو فەیلەسوف نیە، زۆر زوو دیكارت پەی بەم مەسەلەیە



برد، دوای ماتماتیك زانەكان ئینجا نۆرەی فەیلەسوفەكان بوو پی بخەنە مەیدانەوە.

دیكارت هەرگیز لەگەڵ كڵێسادا كێشەی نەبوو، ئەگەر ئێوە گومان لە هەموو شت بكەن بێجگە لە هەقیقەتی بیركردنەوە كەواتە خودا چی لێ دێت. دیكارت بەختی یار بوو كە تووشی گاشەی كڵێسا نەبوو، بەڵام خۆشبەختی زیاتری دیكارت لەوەدا بوو كە لە هوڵەندا دەژیا، بە جۆرێكی دی، لە هۆڵەنداا سەفەری دەكرد.

لە ساڵی ١٦٣٨دا، بۆ پانزەهەمین جار لەو كاتەوەی كە لە ویلایەتە یەك گرتووەكانی هوڵەند بوو دیكارت شوێنی خۆی گۆری. ئەمجارەیان چوو بۆ ئامر سفورت كە دەكەوێتە پاڵ شاری دانشگایی -ئوترخت-ەوە. ئەوسا تەمەنی كچەكەی پێنج ساڵان بوو، دیكارت دەیویست بینێرێتە فەرەنسا تا "خانمێكی ئەدەب زان"ی لێ دەربچێت، كەچی لە پڕا فرانسین نەخۆشكەوت و مرد، وەرەی دیكارت تەواو دابەزی، ئەمە تاڵترین زەبرێك بوو كە لە هەمو تەمەنیا بەریكەوتبێت و بەقسەی ژیان نامە نووسەكەی، ئادرین بایە: "دیكارت بەو دڵە ناسكەیەوە لە پرسەی كچەكەیدا گریا، ئەوەی دەرخست كە





خەمی تایبەتی دەتوانێت بیری نەمریی لە زەینی مرۆڤدا بكوژێنێتەوە"

كاتێك ئەم كارەساتە ڕوویدا كە دیكارت لەسەرو بەندی تەواوكردنی كتێبی **ڕامانەكان**[9] دا بوو، بە گشتی ئەمە بە شاكاری دیكارت دادەنرێت، هەرچەندە كتێبی ڕامانەكان لەسەرەتادا ئەو ڕاكێشانەی نیە كە باسێك لە بارەی میتودەوە هەیەتی، بەڵام هەمان جوانیی داڕشتنی تیایەو، زمانەكەیشی نموونەیەكی تەواوە لە دەربڕینی بیرو باوەڕە ڕووتەكان (دیكارت ئازایانە بانگەوازی ئەوەی دەكرد كە كتێبی ڕامانەكانی بۆ ئەوە نووسیوە كە خوێندنەوەی بیرو باوەڕە ڕووتەكان لای خانمەكان پڕ لە جۆش و خرۆش بكات) وەلێ ئەمجارەیان دیكارت پارێزی كرد و نوسخەی یەكەمی بۆ باوكی مرسان لە پاریس نارد تا ئەو دابەشی بكات و "سەرنجی بلیمەتەكان" لە بارەیەوە بزانێت، دیكارت پێی خۆشبوو بیرمەندە دیارەكان و هەروەها یەسوعیەكان پاڵپشتیی كتێبە فەلسەفیە تازەكەی بكەن كە شەرحێكی وردی ئەو بیرو ڕایانەی تیا بوو كە پێشان لە باسێك لە بارەی میتودەوە خرابوونە ڕوو. لە كتێبی ڕامانەكاندا دیكارت بە بەرنامەیەكی بەرفراوانترەوە باس لە گومان دەكات، ئەو وای بۆ دەچێت كە هەموو دنیا،



تەنانەت هەقیقەتەكانی زانستی ئەندازەو ئەو پاڵتاوە زستانیەی كە لەبەر خۆیدایەو لەبەردەم ئاگردا دانیشتوە، هەموو ئەمانە بەرئەنجامی پێشدەستی بوونەوەرێكی بەد سروشت و نادیارە كە دەیەوێت ئەو لاس بدات.

(زانا سایكۆلۆژیەكان بە دڵنیایی تەواوەوە گازندەی ئەوەیان كردوە كە ئەم كەسایەتیە سەلبیە بێجگە لە قازی ژواكیم دیكارت كەسی تر نیە) جارێكی دی زەینی گومانكەری دیكارت بە هەمان ئەسڵی پێشوەوە كە قابیلی نكوولی لێ كردن نیە دەست پێ دەكات و هەر لەسەر بنەمای ئەم ئەسڵە بەڵگە نەویست و سەلمێنراوەوە هەموو دنیا لە نوێ دروست دەكاتەوە. ئەو تا ئەو شوێنە پێشڕەویی دەكات كە بوونی خوایش دەسەلمێنێت. بۆ ئەوەی هیچ نەبێت خەیاڵی كڵێسایش ئاسودە بكات ئەو بەڵگانەی كە بۆ ئەم بۆچوونانە بەكاری دەهێنێت، چوارسەدە پێشتر لە لایەن سانت ئانسلم و سانت توماس ئەكیونییەوە خرابوونە ڕوو.

ئەگەر چی پرۆسەی گومانی دیكارتی بە مانای تەواوی وشە لە داهێنانی دیكارت نەبوو، بەڵام لەو سەردەمەدا ڕێك بە داهێنانی ئەو دەدرایە قەڵەم، سانت ئۆگستین نزیكەی دوانزە سەدە پێش دیكارت، میتودو





ئەنجام گیریەکی لەو بابەتەی باس کردبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە بیری ئۆگستیندا دوریێکی تەوەریان نەبوە تەواو لە بیر کراون.

بەڵام جێی سەرنجدانە کە کەمێك پێش خودی دیکارتیش فەیلەسوفێکی پورتوگالی بە ناوی فرانسیسکو سانچزەوە، بە وردی هەمان بەرنامەی ئەو گومانە فراوانەی لە کتێبێکی سەر سووڕهێنەردا بڵاوکردەوە بە ناوی **بۆ ناتوانین هەموو شتێك بزانین**[١٠] ئەم کتێبە لە ساڵی ١٥٨١ز بڵاوبووەوە، سانچز بەختی یار بوو کە لەو سەردەمەدا کتێبەکەی سەرنجی کەسی ڕانەکێشا، ئەگینا لەباتی ئەوەی لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا لە شاری تولوز بەو پەڕی ئارامیەوە بمرێت. ڕەنگە لە تەمەنی سی و یەك ساڵیدا وەك قارەمانێکی مەزن لە ڕێگای فەلسەفەدا لە سێدارە بدرایە.

دیکارت خولیای قارەمانیی لەسەردا نەبوو. بەڵام بۆ بە نەناسراوی مانەوەیش هەوڵێکی وای نەدەدا. هەرچەندە هەمووئەو تایبەتمەندیانەی تیا بوو کە بە نەناسراوی بمێنێتەوە. (بە تەنیا تەمەڵیەکەی بۆ ئەم لایەنە بەس بوو) دیکارت دەیویست دەنگی بە هەموو کەسێك بگات و لە هەمان کاتیشدا بیرو ڕاکانی لە زەینی



خەڵکیدا پەسەند بکرێن. ئەو بە تەواوی قەناعەتی پەیدا کردبوو کە ڕاست دەڵێت، بەڵام دەیویست کڵێسایش لەم بارەیەوە قایل بکات. هەر لەم ڕوانینەوە، باوکی مرسان بە پێی داواکاریەکەی دیکارت، نوسخەی یەکەمی کتێبی ڕامانەکانی بۆ کەسایەتیە فیکریە دیارەکانی ئەورووپا وەك گاسندی هابزو ئارنولد نارد. ئەوانیش بە ڕەخنە و بۆچوونەکانیان وەڵامی تیورەکانی دیکارتیان دایەوە، ڕەخنەکان ئازاریان بە دیکارت گەیاند، پێیان وت کە وەڵامی ڕەخنەکان لە کتێبەکەدا بڵاو بکاتەوە. بەم جۆرە نوسخەی کۆتایی ڕامانەکان چاپ کراو ڕەخنە و وەڵامەکانی دیکارتیشی لەسەر ڕەخنەکان تیا بوو.

وەك پێشبینی دەکرا، بڵاو بوونەوەی کتێبی ڕامانەکانی دیکارت هەراو زەنایەکی زۆری خستەوە، یەسوعیەکان تەواو لەوە گەیشتن کە گومانی دیکارتی، مەسەلەی **من بیردەکەمەوە کەواتە هەم** کۆتایی هێنانە بە فەلسەفەی قوتابخانەیی (سکولاستیك)ی و ڕێنماییەکانی ئاکویناس. بەڵام بۆ نەگبەتی ڕۆژگار ئەمجارەیان شەڕەکە لە هۆڵەندا نزیك ببووەوە. زانکۆی ئوترخت. دیکارتی بەوە تاوانبار کرد کە نکوولی ئینکار–ی لە خوا دەکات. زۆر بە ئاشکرا دیکارتی





چواندبوو بە وانینی، **وانینی** بەوە تاوانبار کرابوو کە هەر بە دەستی ئانقەست کۆمەڵێك بەڵگەی لاوازی لەسەر سەلماندنی بوونی خوا هێنابووەوە کە بەڵگەکان نەیاندەتوانی بوونی خوا بسەلمێنن، (وانینی بەو تۆمەتەوە ساڵی ١٦١٩ز لە شاری تولوز سوتێنرا. ڕەنگە هەر لە هەمان جێگادا بوو بێت کە فەیلەسوفێکی پورتوگالی پیرو گوم ناویش هەر لەناو خەڵکەکەوە تەماشای وانینی دەکرد و لەژێر لێوەوە دەیوت: "ئەگەر بەزەیی خوا نەبوایە ئەو بەڵایە بەسەر منیش دەهات...")

لەدوای بەقسە پەلاماردانی سەرۆکی زانکۆی ئوترخت بۆ سەر دیکارت، چەندین کەسایەتی ناسراوی هۆڵەندیش هاتنە مەیدان و زەبری کاریگەرتریان لێداو تەنانەت بە هەڵگەڕاوە مرتد-یش تاوانباریان کرد، هەڵبەت لەو شوێنەدا نکوولی لە خودا کردن تاوانێکی گەورە بوو. بەڵام تاوانی هەڵگەڕانەوە زۆر جیدی تر بوو، خۆشبەختانە سەفیری فەرانسە بە قازانجی دیکارت هاتە ناو کارەکەوەو لە دواییشدا مەسەلەکە کۆتایی پێ هات، هەرچەندە تا ماوەیەك دوای ئەوەیش بچووکترین ئاماژەی ئەرێ یان نەرێ (مثبت و منفی) بۆ ناو و بەرهەمی دیکارت لە چوار چێوەی زانکۆی ئوترختا قەدەغە بوو.



بەڵام پاش ماوەیەك، لەدوای بەدەنگ هاتنی گرووپەکی ماتماتیکی زانکۆکە کە ئیدی توانای ئەنجامدانی وانەی ئەندازەی نەبوو. ئەو قەدەغە کردنە شکێنرا.

لەو سەردەمەدا دیکارت لەسەرانسەری ئەورووپادا ناسرا بوو، ناوبانگی ئەو لە هەندێك لە بیرمەندان زیاتر بوو، بە جۆرێك کە تەنانەت خانەوادە شاهەنشاهیەکانی ئەورووپا بەرهەمەکانیان دەخوێندەوە. کاتێك کە شا ژنی جوانی سویدی کریستینا، یەکێك لە کتێبەکانی خوێندەوە هێند کەوتە ژێر کاریگەریەوە کە دیکارتی بانگهێشتی دەربار کرد، دەبوو دیکارت بۆ دەرس وتنەوە بە شاژن بڕوات بۆ ستوکهوڵم، لەو کاتەدا، دوای سالانێکی درێژی درەنگ لە خەو ڕابوون و بیرکردنەوە لە ئاسایش وردە وردە کاریگەریەکی سەلبی لەسەر دیکارتدا دەنا، هەرچەندە تەمەنی تەنیا پەنجا و سێ ساڵ بوو، بەڵام چوار ساڵ بوو جێ گورکێی نەکردبوو.

لەم قۆناغەدا دیکارت ماڵێکی چکۆڵەی لە ئاگموند بینن، کە بیست میلێك لە باکووری ئەمستردامەوەو نزیك بە دەریا بوو. بۆ نیشتە جێ بوونی خۆی هەڵبژاردبوو. ئەو لە ژووری خوێندنەوەی هەشت لایی ماڵەکەیدا دادەنیشت، تەماشای باخێکی جوان و کۆنی دەکرد و





بیری دەكردەوە، هەندێك جار دیكارت دەچوە پاریس تا بیرو ڕاكانی لەگەڵ هاوكارە كۆنەكانی وەك گاسندی، پاسكاڵ، هابز و ئارنولدا باس بكات.

بیری سەفەری دورو درێژ بۆ باكوورو بۆ "سەر زەمینی ورچەكان، لە نێوانی بەردو بەستەڵەكدا" (بەو جۆرەی كە خودی دیكارت لە سوید باسی دەكرد) لەبەرچاویدا زۆر خۆشی هێن نەبوو. بەڵام شاژن كریستینا ژنێكی بە ئیرادەو خاوەنی بڕیار بوو. ئەگەرچی تەمەنی لە بیست و سێ ساڵ تێ نەپەڕیبوو، دەسەڵاتی تەواوی بەسەر وڵاتەكەیدا هەبوو، باڵای پێنج فوت (= ١٥٢ سانتیمەتر) زیاتر نەبوو، بەڵام شانی پان و وەك سەرباز فێر كرابوو. دەڵێن بێ ئەوەی هەست بە ماندو بوون بكات دەیتوانی ماوەی دەسەعاتی ڕێك ئەسپ بئاژوێت (هەرچەندە مرۆڤ لە خۆگری ئەو ئەسپە سەری سووڕ دەمێنێت) كاتێك كە دەسەڵاتی لە دەست گرت سوێندی خوارد كە پایتەختەكەی خۆی، واتا ستوكهوڵم، كە بەهۆی ئاو تیاوەستانی زۆرەوە ناوی ڤینزی باكوریان لێ نابوو، بیكات بە پاریسی باكور و مەڵبەندێكی كلتوری لێ بسازێنێت. لەگەڵ هەوڵ و تێكۆشانی زۆریدا، ستوكهوڵم هەر بەو ستوكهوڵمیە مایەوە. دیكارت بۆ شاژن بە شانسێكی گەورە دادەنرا،



بۆیە بڕیاریدا بەهەر قیمەتێك بوە لە دەستی نەدات. شاژن بۆ بەهێز كردنی بانگهێشتنەكەی خۆی لە دیكارت، كەشتیەكی جەنگی لەگەل دەریا سالارێكدا بۆ هێنانی دیكارت ناردە هوڵەندا، وەلێ دیكارت حەزی بە چوونە سوید نەبوو، هەرچەندە ئەم كاری قایل نەبوونەی زۆر بە ئەدەبانەوە ئەنجامدا، ئەو نامەیەكی زمان لووسانەی دایە دەریا سالار و تیایدا نووسی كە "خاوەن شكۆ شاژن، زیاد لە هەر مرۆڤێكی دی سیمای یەزدان بەرجەستە دەكات" بەڵام لە شاژنی خواست لێی ببورێت كە ناتوانێت بڕوات و "دەركی پڕ لە شكۆمەندی و نووری ئەو بكات"

كریستینا دوای خوێندنەوەی نامەكە توند پێی بە زەویدا كێشا. ئەو ڕۆژەی دەربار ڕۆژێكی خراپ بوو، ئەو چەند سەعاتێكی بە ئەسپ ئاژوتن بەسەر بردو پاشان كەشتیەكی تری بۆ هۆڵەندا نارد، دیكارت كە لە باس و خواسی زانستی و فەلسەفیدا گەورەترین بیرمەندانی ئەوروپای شكست دابوو ئەمجارەیان ناچار بوو ئەم شكستە قبووڵ بكات و خۆی بە دەستەوە بدات. دیكارت ساڵی ١٦٤٩ز بەرەو ستوكهوڵم سواری كەشتی بوو، شاژن كریستینا ڕێو ڕەسمێكی زۆر گەورەی بۆ پێشوازی لێ كردنی سازدا، پاشان، دیكارت دوو دانیشتنی وانەی





تایبەتی بۆ شاژن دانا، وەلێ وا پێ دەچوو کە لە خوێندنەوەی بەرهەمە فەلسەفیەکانی دیکارت هیچی دەست گیرنەبێت و شاژن بەو ئەنجامە گەیشت کە کاری لەوە گرنگتری لە پێشە بۆ ئەنجامدان.

دیکارت شەش هەفتەی تەواوی بەبێ کاری بەسەر برد تا زستانی گورچکبڕی سوید گەیشت، زستانێك کە بە درێژایی شەست ساڵی پێشوو سەرمای وای بە خۆیەوە نەدیبوو. شەش مانگی تەواو بەفر شاری داپۆشی، لە نیوەڕواندا دنیا تاریك و هەور لەسەر بوو، لە هەندێك جێگای دوور لە شارەوە، لە ژێر بریسکەی ساردی رووناکیی قوتبەکاندا گورگەکان دەیان لوراند.

کریستینا کە لەوە دڵ گرانبوو توانای قووڵی دیکارت لەسەرمای پایتەختەکەی ئەودا بە فیڕۆ بچێت، ئەرکێکی تازەی لە ئەستۆی دیکارت نا، دیکارت ئەم ئەرکەی بە نابەدڵی وەرگرت و خۆی سەرقاڵی رێك خستنی ئەو شیعرانە کرد کە بە ناوی "لەدایك بوونی ئاشتی"یەوە بۆ بالیەیەك ناوزەد کرا بوو کە بڕیار بوو لە ڕۆژی لە دایك بوونی کریستینادا ساز بکرێت. پێ دەچێت دیکارت ئاشنایەتیەکی تەواوی لەگەڵ موسیقادا هەبوو بێت، چونکە هەر لەگەڵ تەواو بوونی ئەم کارەدا داوایان لێ کرد نمایشێکی کۆمێدی موزیکال لە بارەی



دوو شازادەوە بنووسێت کە خۆیان بە دوو شوان بزانن (بەداخەوە، لە هیچ یەکێك لە بەرهەمە بڵاو کراوەکانی دیکارتا ئاماژەیەکم لەسەر ئەم کارانە دەست نەکەوت هەڵبەتە بێجگە لەو قسەیەی کە لە کاتی خەمباریدا وتوویەتی: "لە مانگە ساردەکانی زستاندا، مێشکی مرۆڤ لە کار دەکەوێت").

لە ناوەڕاستی مانگی ژانویەدا، کریستینا جارێکی تر بڕیاریدا دەست بە خوێندنی دەرسی فەلسەفە بکاتەوە، دیکارت ئامادە بوو، پێیان ڕاگەیاند کە شاژن ئارەزووی سێ وانەی فەلسەفە دەکات لە هەفتەیەکدا و وانەکانیش سەعات پێنجی بەیانی دەست پێبکەن.

دیکارت لە کاتی سەربازییشدا هەرگیز پێش سەعات یانزەی بەیانی لەخەو هەڵنەدەستا. مۆتەکەی لەخەو هەستانی سەعات چواری بەیانی لە زستانی زۆر ساردی ئەسکەندەناڤیدا، گەیشتن بەو حاڵ و وەزعە دیارەو بەو دڵە ڕاوکێ تایبەتیەی فەرەنسیەکەوە لەو ساتانەدا کە تەنیا گورگ بە ئاگان و پاشانیش گالیسکە سوارێك بەسەر بەستەڵەکی شەقامەکانەوە کە وەك ئاسن سفت ببوو، ئەمەیش لە سەرمای هەرە سەختی قوتبی باکوردا.. پێویست ناکات زۆر لەسەر ئەوە بڕۆین کە لە حاڵێکی وادا دەبێت هەستی دیکارت چۆن بوو بێت. لە





**ماوەی دوو هەفتەدا سەرمایەکی وای بوو کە لێی کرد بە نەخۆشی سنگ. دوای هەفتەیەك کەوتە وڕێنە کردن و لە پانزەی فوریەی ١٦٥٠ز دا کۆچی دوایی کرد. یەکێك لە دیارترین بلیمەتەکانی ئەوروپا بوو بە قوربانیی ئارەزوویەکی شاهانە. دیکارت کە کەسێکی زۆر مەزەبی و لە هەمان کاتدا کاسۆلیك بوو. نەیویست لە وڵاتێکی پروتستانتی وەك سویدا، لەو شوێنەدا بنێژرێت کە مردوەکانی تری تیا دەنێژن. لەبەرئەوە لە گۆڕستانێکدا کە تایبەت بوو بەو منداڵانەوە کە تەعمید نەکراون دیکارتیان ناشت.**

**سیانزە ساڵ دوای مەرگی دیکارت، کلێسای کاسۆلیك یادی دیکارتی بە بەرز ڕاگرت و هەموو بەرهەمەکانی لە پێرستی بەرهەمە قەدەغەکراوەکانی کلێسادا دانا؛ (بەم جۆرە دەستەبەری ئەوە کرا کە ئەم بەرهەمانە ساڵەهای ساڵ ببێتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی پەیوەند دارەکان) پاشان، لە سەدەی حەڤدەدا لاشەکەیان گوێزایەوە بۆ پاریس و لەوێ ناشتیان. لە کاتی شۆڕشی فەرەنسادا پێشنیاز کرا کە جارێکی تر گۆڕەکەی هەڵبدەنەوەو لە گۆڕستانی پانتیون، لە پاڵ بیرمەندە گەورەکانی تری فەڕەنسادا بە خاك بسپێردرێت. ئەم مەسەلەیە بۆ ڕا دان خرایە بەردەم ئەنجومەنی**



**نیشتمانیەوە، لە هەڵوێستێکی نا ئاساییدا، ئەندامانی ئەنجومەنەکە لەسەر بنەمای دیدی زانستیانەی خۆیانەوە بوون بە دوو بەشەوە. گرووی یەکەم دیدی میکانیکی دیکارتیان لە بارەی دنیاوە پەسەند دەکرد و بەرانبەر بەمانە گرووی دوەم بەرگریان لە تیوری ڕاکێشانی نیوتن دەکرد.**

**دیکارت بۆ ڕوون کردنەوەی پەیوەندیەکانی دنیا، تیوری (گێژەلوکەکانی) خستبوە ڕوو، بەپێی ئەم تیورە، جووڵەی گەردیلەیەك کاردەکاتە سەر هەموو گەردیلەکانی تری دنیا. ئەم کاریگەریە لە ڕێگای کۆمەڵێك لە گێژەڵووکەی بەیەکدا چوەوە دروست دەبێت کە هەموو شتێك لە کۆمەڵەی خۆر و ئەستێرەکانەوە بیگرە تا بچووکترین گەردیلە دەگرێتەوە. (هەڵبەتە ئەم ڕوانینە بەرەو سیستمێکی زۆر ئاڵۆز سەر دەکێشێت، کە تەنیا ماتماتیك زانێك لە عویەی هەست پێ کردنی دێت. وەلێ بەهەر حاڵ، دیدگای دیکارتی لە ڕێڕەوی بیری مرۆڤدا ئاماژە بە نوختەیەکی گرنگ دەکات. تیورەکانی دیکارت بەچەشنێکی بەرچاو لە هەردوو شریتی لوول پێچی DNA دەچێت، هەروەها لە تیوری هەوری ئەلەکترونەکانیش دەچێت لە بارەی ئەتۆمەوە، دیسان دیکارت، لە هەوڵی بەردەوامی خۆیدا بە دوای ئەو**





هێزەدا کە دەتوانێت پەیوەندیەکی هاوبەرانبەر لە نێوان زەین و جەستەدا دروست بکات، شتێکی دۆزیەوە کە لە شێوەی شەپۆلەکانی رادیۆ یان ئەلەکتریکدایە. بە بڕوای بیرمەندی تازە ژاندو ماندویل، ئەم بابەتە ئەوە دەردەخات کە تا ڕادەیەك زەینی مرۆڤ بێ ئەوەی ڕو لە ئامانجی خۆی بکات لە ڕەوت گەلێکی چەمکە دیاری کراوەکاندا دەجووڵێت) .

کاتێك کە مەسەلەی گۆڕینی گۆڕی دیکارت لە ئەنجومەنی نیشتمانی فەرەنسادا خرایە دەنگدانەوە، لایەن گرانی تیوری نیوتن بەسەر لایەن گرانی دیکارتا سەرکەوتن، تیوری ڕاکێشان (جاذبیە) لەو ڕۆژگارەدا زۆر باوی هەبوو، بەم جۆرە دیکارت ڕێی لە گۆڕستانی مەزنەکان نەکەوت.

هەقیقەت، کە پێشان لە خانەی خودا ناسیدا بۆی دەگەڕان هاتبوە نێو قەڵەمڕەوی دیموکراسیەوە، دیکارت لە هیچ یەکێك لەو دوو شوێنەدا جێگای نەبووەوە، ئێستا گۆڕی دیکارت لە کڵێسای سانت ژرمن دپرە، لە سەنتەری کارتیە لاتن لە پاریسدایە ئەو شوێنەی کە دابی بیرکردنەوە لەگەڵ گومان کردن و لەخەو هەستانی نیوەڕواندا، تا ئەمڕۆیش زۆر بە وردی پەیڕەوی لێ دەکرێت.



## پەراوێزەکان

*(١) Rene Descarts.*

*(٢) Lanaye پایتەختە مێژووییەکەی هۆڵەندا نیە کە ئەویش هەر هەمان ناوی هەیە. پایتەختی ئێستای هۆڵەند ئەمستردامە.*

*(٣) Rosicracians تیپێکی نێو نەتەوەیی کە مەیلی عیرفانیان هەیە.*

*(٤) Frisian Islands کۆمەڵێك دوورگەی دەریای باکوور.*

*(٥) Treatise on rules for the direction of the mind*

*(٦) Cartesian*

*(٧) Parhetiau*

*(٨) Treatise on the universe*

*(٩) Meditations*

*(١٠) Quod Nihil scitur*





## پاشەکی

تا پێش دەرکەوتنی دیکارت، فەلسەفە لە خەوێکی قووڵدا بوو، سەردەمی نوێی فەلسەفە لەگەل دیکارتا سەری هەڵدا، لەو کاتە بەدواوە، ڕەسەنایەتی تاك و شیکاری هوشیاریی مرۆڤ بوون بە مەسەلە سەرەکیەکانی فەلسەفە، باری فەلسەفە تا ماوەیەکی پێشتریش کەم و زۆر هەر بەو شێوەیە مابووەوە، تەنیا بەسەرهەڵدانی فەلەسەفەی شیکاریی بوو کە ڕەسەنایەتی تاك و شیکاریی هوشیاریی مرۆڤ جێگای خۆی دایە رەسەنایەتی واژەکان و شیکاریی ناوەرۆکەکەی. جارێکی دی، فەلسەفە لە چاوەڕوانی دیکارتێکدایە کە ئەمە لە خەو هەستێنێت.



## لە نووسینەکانی دیکارت

زۆر لەمەوبەر، بۆ یەکەمین جار هەستم بەوە کرد کە گەلێك بیرو باوەڕی ناڕاستم لەسەردەمی منداڵیدا وەك ڕای ڕاست وەرگرتوە. لەوەیش گەیشتم کە بناغەی ئەو هزرانەی من کە تەواو لەسەر بنەمایەکی نا ڕاست دروست ببون تا چ ڕادەیەك پشتیان پێ نەدەبەسترا، بۆیە لەوە گەیشتم ئەگەر بمەوێت لە زانستا بە ئەنجامی تۆکمەو ڕەسەن بگەم، دەبێت راستەوخۆ و بۆ هەمیشە دەستبەرداری ئەو ڕایانە بم کە پێشان هەمبوون و کارەکانیشم بەتەواوی لەسەر بنەمای نوێ دەست پێ بکەم.

رامانەکان

ڕامانی یەکەم: دێڕەکانی سەرەتا.





گەلێك جار فرە قانونی دەبێتە هۆی ناعەدالەتی، کەواتە کاتێك دەتوانرێت بەسەرکەوتویی فەرمانڕوایی وڵاتێك بکەیت کە یاساکان کەم و بە تەواوی پەیڕەویی بکرێن. بەم جۆرە، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە لە بری ئەو یاسا زۆرانەی کە لۆژیك پێك دێنن، چوار یاسا کە لە مەودوا باسیان لێ دەکەین تەواو بۆ مەبەستەکانی من بەسن. بەو مەرجەی کە بەشێوەیەکی جیدی و جەخت لێ کردن، لە هەموو قۆناغەکانی کاردا بە چاکی پەیڕەوییان لێ بکەم.

یاسای یەکەم ئەوەیە کە هەرگیز هەر شتێك بە روونی و ئاشکرایی نەزانم راستە بە ڕاستی نەزانم. بە وتەیەکی دی، لە هەموو جۆرە حوکمێکی پێش وەخت و زەینیەتێکی پێشینە دوور بم و هیچ شتێك بێجگە لەوەی کە لە زەینی مندا روون و ئاشکرایەو بەڵگەیەکی دوو دڵیم لەسەری نیە بڕیاری بەسەردا نەدەم.

یاسای دووەم ئەوەیە کە هەریەکێك لەو مەسەلانەی دەتەوێت لێیان بکۆڵیتەوە دابەشیان بکەیت بۆ زۆرترین بەش، کە بۆ بە دەست هێنانی ڕێگا چارەیەکی شیاو زۆر پێویستن.

سێیەم یاسا ئەوەیە کە بیرو باوەڕی خۆم بە ڕێگایەکی ڕێك و پێکدا بەرەو پێش بەرم، بە جۆرێك کە



بزاڤەکە لە سادەترین و زانراوترین بابەتەوە دەست پێ بکەم و دوای ئەوە، هەنگاو بە هەنگاو و وردە وردە بەرەو زانیاری ئاڵۆزتر بڕۆم. لەم ڕەوتەدا تارادەیەك ڕێك و پێکی دەبەخشمە بابەت کە لە ڕواڵەتدا چ جۆرە ڕێك و پێکیەکیان پێوە دیار نیە.

دوا یاسا ئەوەیە کە هەمیشە هەموو بەشەکانی مەسەلەکە بەشێوەیەکی کامڵ بژمێرم و بە هەموو قۆناغەکانیدا بڕۆم تا لەوە دڵنیا بم کە مەبەستێك لە قەڵەمەکەم نەترازاوە.

باسێك لە بارەی میتودەوە، بەشی یەکەم.

ئەو بەڵگاندنە سادەو ئاسانانەی کە ئەندازە زانەکان بە دورودرێژی بەکاری دێنن و بەهۆیەوە پەی بە ئاڵۆزترین ئەنجام دەبەن، دەمانخەنە سەر ئەو ڕایەی کە هەموو ئەو شتانەی دەشێت ببنە بابەتی زانستیی مرۆڤ، بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، تا ئەو کاتەی کە ئێمە لەباتی بیری ناڕاست ڕای ڕاست وەربگرین و لە بیرکردنەوەی خۆماندا، نەزمێکی پێویست بۆ ئەنجامگیری هەقیقەتێك لە هەقیقەتێکی دی بپارێزێن، ئەگەر ئەمانەمان کرد ئەوا هیچ زانستێك





لەوەی کە ئێمە بە دەستمان هێناوە بالاتر نابێت و هیچ هەقیقەتێکیش ئەوەندە شاراوە نابێت کە نەتوانین بیدۆزینەوە.

من لە دیاریکردنی ئەو بابەتانەدا کە دەبوو کارەکانمی لێوەدەست پێ بکەم هێند روو بە رووی کێشە و گرفت نەبوومەوە، چونکە هەر لە سەرەتادا لەو باوەڕەدا بووم کە دەبێت ئەم بابەتانە سادەترین و ئاسانترین حەقیقەتە زانراوەکان بن.

باسێك لە بارەی میتۆدەوە، بەشی دووەم

بەو پێیەی کە ئارەزوومەندی ئەوە بووم خۆم بە تەواوی بۆ گەڕان بەدوای هەقیقەتدا تەرخان بکەم، پێویست بوو... هەر شتێك کە بچووکترین گومانم لە خۆیدا بۆ پەیدا بکات، بە موتڵەقی بە ناڕاستی بزانم، بۆ ئەوەی پاشان لەوە بگەم کە ئایا هەقیقەتێك بۆ من دەمێنێتەوە کە هیچ گومان هەڵنەگرێت یان نا، لەبەر ئەوەیش کە هەستی مە هەندێك کەرەت فریومان دەدات. بڕیارمدا گریمانەی ئەوە بکەم کە هیچ شتێك لەواقیعدا بەو شێوەیە نیە کە هەستمان پێمان دەڵێت. لەبەر ئەوەیش کە هەندێکمان لە بەڵگاندندا تووشی هەڵە



دەبین و تەنانەت لە سادەترین مەسەلەی ئەندازیاریدا تووشی هەڵەی لۆژیکی دێین، من هەموو بەڵگاندنەکانی خۆم کە پێشان بۆ سەلماندنی گەلێك لە مەسەلە جیاوازەکان کەڵکم لێ دیبوون، بەهەڵەم دانان، لە دواییشدا، کاتێك بینیم ئەوەی بە وردی لە کاتی بێداریدا دەرکی پێ دەکرێت، لە خەونیشدا، کە کاتی دەرك کردنی هیچ شتێك نیە، لە بیری ئێمەدا نەخش دەبەستێت، هاتمە سەر ئەو گریمانەیەی کە تا ئێستا هەر شتێك بەزەینی مندا گوزەری کردوە بێجگە لە خەون چی دی نەبوە.

بەلام بەردەوام حسابی ئەوەم کرد کە لە کاتی گوزەری ئەم بیرو باوەڕانەداو، بەهەڵە دانانی هەموو مەسەلەکان، بەهەر حاڵ بە موتەلەقی ئەوە پێویستە کە من، واتا منی بیرکەرەوە، وجودم هەبێت، بۆیە گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئەم هەقیقەتە، واتا من بیردەکەمەوە، کەواتە هەم هێند بنج بڕ و سەلمێنراوە کە هیچ دوو دڵی و گومانێك، تەنانەت گومانکەرترین کەس، ناتوانێت بیلەرزێنێت. بۆیە بەو ئەنجامەگەیشتم کە دەتوانم ئەم هەقیقەتە، بێ ئەوەی کەمترین گومانم هەبێت، وەك



PDF 4 KURD

ئەسڵی یەکەم فەلسەفەیەك کە لە سەرو بەندی دروست کردنیام، قبووڵ بکەم.

باسێك لە بارەی میتۆدەوە: بەشی چوارەم

جیاوازیەکی زۆر لە نێوان زەین و لەشدا هەیە، چونکە لەش لەسەر بناغەی ماهیەتی خۆی هەمیشە قابیلی دابەش بوونە، لە کاتێکدا کەزەین بە هیچ جۆرێك دابەش بوون قبووڵ ناکات، چونکە کاتێك من زەین وێنا دەکەم، یان باشتری بڵێم، کاتێك کە خۆم تەواو وەك بوونەوەرێکی بیرکەرەوە وێنا دەکرێم، هیچ جۆرە پارچەیەك لە بوونی خۆمدا دیاری ناکەم و بەڕوونی لەوە دەگەم کە بوونەوەرێکی بە تەواوی سادەو تەنیام.

ئەگەر چی وا دێتە بەرچاو کە هەموو زەینی من لەگەڵ تەواوی لەشمدا یەکیان گرتوە. بەڵام کاتێك کە پێیەکم یان دەستێکم یان هەر ئەندامێکی تر لە لەشم لێ بکرێتەوە، هەرگیز هەست بەوە ناکەم کە شتێك لە زەینم کەم بۆتەوە.

بێجگە لەمە، هیچ یەکێك لە حاڵەتە زەینیەکانی وەك ئیرادە، دەرك پێ کردن و وێناکردن و لەم بابەتانە ناتوانیت بە بەشێکی زەینی ناویان بەریت، چونکە



هەمیشە زەینێکی تەنیا ئیرادە دەکات و درك دەکات و وێنا دەکات. لە کاتێکدا کە ئەمە لە بارەی بوونەوەرە مادیەکانەوە بە پێچەوانەوەیە، چونکە ناتوانم هیچ یەکێك لەم بوونەوەرانە وێنا بکەم کە قابیلی دابەش بوون نەبن، بەم پێیە هەرچی بوونەوەرە قابیلی دابەش بوونە.

رامانەکان: رامانی شەشەم

لە نێو گرووی مرۆڤدا هەست لە هەر شتێکی دی یەکسان تر بەسەریاندا دابەش بوە. چونکە هەموومان تا رادەیەکی باش خۆمان لەم هێزە بە بەهرەمەند دەزانین و تەنانەت ئەوانەی کە لە شتی تردا گلەییان لە بەشەکەیان هەبێت، بەدەگمەن بۆ بەدەست هێنانی هەستی زیاتر تەعبیر لە ئارەزووی خۆیان دەکەن. لەم بارەیشەوە، ناشێت هەموو مرۆڤەکان هەڵە بن، وا دەردەکەوێت ئەو هێزەی کە حوکمی راستەقینە دەدات و دەتوانێت چاك لە خراپ کە رێك ئێمە ناوی درکی راستەقینە یان ئاوەزی لێ دەنێین– لەسەر بنەمای سروشت لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا جیا بکاتەوە، ئەو هێزە بەجۆرێکی دادپەروەرانە دابەش کرابێت. لە ئەنجامدا، ڕای جیاوازی





ئێمە لەوەوە سەرچاوە ناگرێت کە ئێمە لە ئەندازەی بەهرەگیریمان لە هێزی عەقڵ لەگەل یەکتردا جیاوازیمان هەبێت. بەڵکوو تەواو لەو شوێنەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئێمە هێزەکانی هزری خۆمان بەرەو چەند ئاقارێکی جیاواز دەبەین و هەمووی بەشێوەیەکی یەکسان بەرەو یەك بابەت نابەین. تەنیا ئەوەندە بەس نیە کە تۆ زەینێکی بەهێزت هەبێت، مەبەستی سەرەکی ئەوەیە کە فێر بین چۆن ئەم زەینە بەرەو ئاقارە ڕاستەکان بەرین. زەینی زۆر بەهێز دەتوانێت هەم بەرەو گەورەترین خراپەکاری هەنگاو بنێت و هەم بۆ بەدەست هێنانی بالاترین شکۆمەندی تێ بکۆشێت. ئەوانەیش کە لە سەرخۆ هەنگاو دەنێن. بۆ ئەوەی بەرەو ڕەوتێکی ڕاست بجوڵێن، لەوانەی کە بەپەلە دەڕۆن و لەو ڕەوتە دەردەچن، زیاتر بەرەو پێشەوە دەڕۆن.

باسێك لە بارەی میتۆدەوە: بەشی یەکەم.



## مێژووی ڕووداوە گرنگەکانی فەلسەفە

| | |
|---|---|
| سەدەی شەشەمی پێش زاین (پ.ز) | سەرهەڵدانی فەلسەفەی ڕۆژئاوا بە هزرەکانی تالس مەلتی |
| کۆتایی سەدەی شەشەمی پ.ز | مردنی فیساگۆرس |
| ٣٩٩ پ.ز | لە ئەسینا فەرمانی مەرگ بەسەر سوکراتدا درا. |
| ٣٨٧ پ.ز | ئەفلاتوون ئەکادیمیەکەی خۆی لە ئەسینا دروستکرد کە بەیەکەمین دانشگا دادەنرێت |
| ٣٣٥پ.ز | ئەرەستۆ قوتابخانەی عەلمانیەتی لە ئەسینا دامەزراند بەرانبەر بە ئەکادیمیەکەی ئەفلاتون. |
| ٣٢٤ زاینی (ز) | ئیمپراتۆر کونستانتین پایتەختی ئیمپراتوریەتی رۆمی گواستەوە بۆ شاری بیزانس. |
| ٤٠٠ | سانت ئاگوستین کتێبی دان پیانان–ی خۆی نووسی. فەلسەفە لە خوداناسیی مەسیحیدا توایەوە. |





| | |
|---|---|
| ٤١٠ | هەرەسی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بە دەستی بەربەرەکان. |
| ٥٢٩ | لە کار خستنی ئەکادیمیای ئەسینا لە لایەن ئیمپراتۆر یوستینین-ەوە، نیشانەی کۆتایی هاتنی سەردەمی حیکمەتی یونانی و دەست پێکردنی سەردەمی تاریکی. |
| ناوەڕاستی سەدەی سیانزەهەم | توماسی ئەکیونی شەرحی خۆی لەسەر ئەرەستو نووسی، سەردەمی فەلسەفەی قوتابخانەیی. |
| ١٤٥٣ | کەوتنی بیزەنتە بە دەستی تورکەکان. کۆتایی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی. |
| ١٤٩٢ | کریستوف کۆلمبس گەیشتە ئەمریکا، سەردەمی ڕێنیسانس لە شاری فلورانس و جارێکی تر ڕێنماییە یۆنانیەکان زیندوبوونەوە. |
| ١٥٤٣ | کوپەر نیکوس کتێبی **لە بارەی سووڕانی هەسارەکانەوەی** بڵاوکردەوە، لە ڕووی ماتماتیکیەوە سەلماندی کە زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێت. |



| | |
|---|---|
| ١٦٣٣ | کلێسا گالیلوی ناچارکرد بە ڕەسمی نکوولی لەوە بکات کە خۆر چەقی گەردوونە. |
| ١٦٤١ | دیکارت ڕامانەکان-ی خۆی بڵاوکردەوە، سەرهەڵدانی سەردەمی فەلسەفەی مۆدێرن. |
| ١٦٧٧ | کتێبی ئاکار-ی سپینوزا لە دوای مردنی خۆی ڕێگای بڵاوکردنەوەی درا. |
| ١٦٨٧ | نیوتن کتێبی(بنەما)ی بڵاوکردەوە کە باس لە چەمکی ڕاکێشان -جاذبیە- دەکات. |
| ١٦٨٩ | (لاك) **باسێك دەربارەی تێگەیشتنی مرۆڤ** ی بڵاوکردەوە، سەرهەڵدانی سەردەمی فەلسەفەی ڕەسەنایەتی ئەزموونەکان. |
| ١٧١٠ | برکلی کتێبی بنەمای دانایی مرۆڤی بڵاوکردەوە و ڕەسەنایەتی ئەزموونی گەیاندە هەواری تازەتر. |
| ١٧١٦ | مردنی لایبنیتس |





| | |
|---|---|
| ١٧٣٩-١٧٤٠ | هیوم کتێبی (لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە)ی بڵاوکردەوە و ڕەسەنایەتی ئەزموونی تا سنوورێکی مەنتیقی بەرەو پێش برد. |
| ١٧٨١ | کانت کە بە یارمەتی هیوم "لە خەوی دوگماتیکی خۆی بە ئاگا هاتوە" کتێبی **ڕەخنە لە عەقڵی پەتی** بڵاوکردەوە. سەردەمی شکۆمەندی میتافیزیکی ئەڵمان دەستی پێکرد. |
| ١٨٠٧ | هیگل کتێبی (دیاردە ناسی زەینی) بڵاوکردەوە کە لووتکەی میتافیزیکی ئەڵمانە. |
| ١٨١٨ | شوپنهاوەر کتێبی (دنیا وەك ئیرادە و وێناکردن)ی بڵاوکردەوە و فەلسەفەی هیندی لە میتافیزیکی ئەڵماندا خستە ڕوو. |
| ١٨٨٩ | نیتچە بە بانگەشەکردنی مەسەلەی "خوامردوە" لە شاری تورین دوچاری شێتی بوو. |



| | |
|---|---|
| ١٩٢١ | فیتگنشتاین کتێبی مەنتیقی فەلسەفی خۆی بڵاوکردەوەوە بانگەوازی ئەوەی کرد کە لەو کتێبەیدا ڕێگا چارەی مەسەلە فەلسەفیەکانی بەدەستهێناوە |
| دەیەی ١٩٢٠ | ئەڵقەی ڤیەنا، پوزیتڤیزمی مەنتیقی برەوپێدا |
| ١٩٢٧ | هایدگەر کتێبی (بوون و زەمانی) چاپکرد کە باس لە جیاوازی فەلسەفە شیکاری و فەلسەفەی ئەوروپایی دەکات. |
| ١٩٤٣ | سارتەر بە بڵاوکردنەوەی کتێبی (بوون و نەبوون) هزرەکانی هایدگەری تەواو کردو فەلسەفەی ئگزیستانسیالیزمی خستە ڕوو. |
| ١٩٥٣ | کتێبی لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی ڤیتگنشتاین لە دوای مردنی بڵاوبوەوە، لووتکەی سەردەمی شیکاری زمان. |

**کۆتایی**





ئەم وەرگێڕانە لە ڕووی دەقە فارسیەکەیەوە

( اشنایی بادکارت )

ئە نجام دراوە.

نووسینی: پۆل ستراترن

گۆڕینی بۆ فارسی : هومن اعرابی

نشر مرکز    چاپی یەکەم ١٣٧٨ ( ١٩٩٩ ).



مافی لەچاپ دانەوەی بۆ

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم پارێزراوە.



